چەمکێک لە ژیاننامەی

# زانایانی فەرموودە

بەرگی یەکەم





ئەندازیار

طه سۆڵەیی

# چەمكێك لە ژیاننامەی

# زانایانی فەرمودە

بـوخاری موسلیم ئەحمەد

مالـیك نەسائی ئەبوداود

ئیبن ماجە تـیرمزی دارمـی


ئەندازیار

طـە سـۆڵـەیی

بسم الله الرحمن الرحيم


ناوی کتێب : چمکێك لە ژیاننامەی زانایانی فەرمودە

ناوی نووسەر: ئەندازیار طه سۆڵەیی

چاپی یەکەم/ساڵی چاپ ١٩٩٩

ژمارەی سپاردنی ( ٤٤٠ ) ی ساڵی ١٩٩٩ی وەزارەتی ڕۆشنبیری دراوەتێ




پێشکەش

بەگیانی پاکی مامۆستا

ئیبراهیم ڕێشاوی ...



❁ ﴿ حدثنا ابوالوليد ، قال حدثنا شعبة عن جامع بن شداد عن عامر بن عبدالله بن الزبير عن ابيه ، قال : قلت للزبير : اني لا اسمعك تحدث عن رسول الله صلى الله عليه وسلم كما يحدث فلان وفلان .... قال : اما اني لم افارقه ، ولكن سمعته يقول : من كذب علي فليتبوأ مقعده من النار ﴾ صحيح البخاري / كتاب العلم رقم الحديث ١٠٤

❁ قال الرسول صلى الله عليه وسلم : ﴿ تركت فيكم أمرين لن تضلوا ما تمسكتم بهما ، كتاب الله وسنة نبيه ﴾ .

موطأ مالك / كتاب الجامع / رقم الحديث / ١٣٩٥



## دەسپێك..

نووسینەوەو دەرخستنی ژیاننامەی ناوداران ، هونەرە، زانستە .. پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ووردو گەڕان و شەن و کەوکردنی زۆر هەیە .. ئەمە بەشێوەیەکی گشتی ، ئەی ئەگەر ئەو ناودارانە کەسانێك بن کە نمونەی بالاَ و ئەستێرەی درەوشاوەی بژارکردن و سوڕاخی فەرموودەکان بن ،ئەوان خۆیان لە هونەر و زانستی سەرناسی و ناسینەوەی دەق و سەنەد و زانستەکانی تری فیقە و شەرع و مێژووزانیدا بێ وێنەبن ، ئەوا پێویست دەکات زۆر زیاتر گرنگی پێبدرێت و هونەرو وردەکاریتێدا بە خەرج بدرێ ... مەخابن ژیاننامەی ئەو کەڵەپیاوانە بە زمانە شیرینەکەی کوردی نەبینراوە ...بە مەبەستی جولاَندنی ئەو پسپۆڕو نووسەرە بەڕێزانەی لە بواری نووسینەوەی مێژووژیننامەی زانایانی فەرمودەناس زۆریان پێیە ئەم چەند لاپەڕەیەمان نووسی بەپشت بەستن بە چەند سەرچاوەیەك ...بێ گومان باسەکان زۆر لەمە زیاتر هەڵ دەگرن و ئە گونجێ چەندین ڕاوڕای جیاوازیش بگرێتە خۆ ...بەو هیوایەی لە ئایندەدا لەسەر سفرەو خوانێکی بەرەکەت دارو ڕازاوە نووسەرێکی کارامە و شارەزا کۆمان کاتەوە لە گەڵ یادی زانایانی فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ... تائەو کاتە ، ئەم هەوڵە بچکۆلەیەمان لە گەڵ ئەوپەڕی ڕێزدا قبوڵ بفەرمون ...

**طه سۆڵەیی**

**سلێمانی / سەرشەقام**

**پایزی ۱۹۹۹**

# ژیاننامەی زانایانی ئەهلی حەدیث بۆ؟!

ئاشــكرایە كـەئاینی پـیرۆزو نـەمری ئیسـلام لـە دووشـوێنەوە سەرچاوە هەڵدەگرێت ، كەیەكەمیان قورئانی پیرۆزە... فەرمایشتی خوای گەورەیە .. سەدوچواردە سورەتە پارێزراوە لەلایەن خوای بالادەستەوە .. هیـچ كـەس وهـێزێك نـاتوانێت تەنانـەت سـورەتێك لـەم قورئانـە مەزنـە ، موعجیزەیــە دەســكاری بكــات .. هــەتا قیامــەت هــەروا بــەپارێزراوی دەمێنێتەوە .. خوای گەورە دەفەرموێت : ( انا نحن نزلنا الذكر وانا له لحافظون ) واتـە : ئێمـە خۆمـان ئـەم پـەیام ودینـەمان دابـەزاندوە ، هـەر خۆیشـمان داكۆكـی لێدەكـەین و دەیپـارێزین ...سـەرچاوەی دووەم فـەرمودەكانی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) بەووردی باس لـە ئاینی ئیسلام دەكات بەهـەموو لقەكانیــەوە ...وەلێ بــەهۆی نەنوســینەوەی هــەموو فــەرمودەكان و تۆمارنـەكردنی هـەموو هەڵسـوكەوتەكانی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) .. تەنـها تۆماربونی لەزیهن و عەقڵ وسنگی هاوەڵاندا پاشان شـەهیدبوون ولـە دنیا دەرچوونی هاوەڵان و بڵاوبوونەوەیان بەجیهاندا ، مەترسی فەوتان و كـەم بونـەوەی ئەو فەرمودانـە دەركـەوت .. لە لایـەكی تریشـەوە ناحـەزانی ئـەم دینـە بەتایبـەتی جولەكە ، لـەكاتێكدا كە زۆر داخ لـەدڵن لـەم ئاینـە نـەمرە لەبری ئەوەی كە پەیڕەوی پەیامی قورئان وپێغەمبـەرێتیمحمد(ﷺ)بن .. كەچی بەپێچەوانەوە ئەوان كەوتنە دژایەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بـەهۆی هەڵبەستنی هەزارەها فەرمودەی درۆ بەدەم پێــغەمبــەری خــواوە بــۆ

شێواندنی ئیسلام ولێڵ كردنی سەرچاوەی پاك و بێ خەوشی ئەم دینە مەزنە كە دەستوور و یاسای هەموو مرۆڤایەتیە و تەنها دینە كە خوای گەورە پەسەندی كردوە وەك بەرنامەو دەستووری ژیانی مرۆڤەكان وەك دەفەرموێت :( ان الدین عند الله الاسلام )... بە عەبدولآی كوری موبارەكیان ووت : چی بكەین ، درۆی هەڵبەستراو زۆرە بەدەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ؟ لەوەلآمدا فەرموی : دەست و مەچەكی زانایانی بۆ خۆش بێت.

بەڵێ هەرچەندە پیلانەكان گەورە بوون ، هیممەتی زانایان لەوان مەزنترو كاریگەر تربوو...كەچی بە داخەوە نەوەی نوێ لە ئاست ئەو زانا خواناسانەدا كەمتەرخەمن و پێویستە هەڵوێستی زیاتر بگرن و شارەزایی ژیانیان بكەنە بەرنامەی لێكۆڵینەوەی زانستی و دۆزینەوەی سەرچاوەی دروستی زانیاری و گرتنە بەری رێگای خواناسی و دڵسۆزی بۆ خاك وگەل ونیشتمان كە لەدینداری راستەقینەوە سەرچاوەدە گرێت .. بژاركردنی فەرمودە نادروست و هەڵ بەستراوەكان لە فەرمودە راست ودروستەكان ، وەجیاكردنەوەی ئەو فەرمودە نادروست وهەڵبە سراوانەی كە بەدەم پێغەمبەری خواوە نوسراون ، ئەركێكی قورس و پڕلەماندویی وگرنگی زانایانیموسوڵمان بوە لەسەرەتای هاتنی ئەم دینەوە بۆیە بەدەیەها كەڵەزانای ئوممەتی ئیسلامی چاكی مەردانەیان لێكرد بەلادا و بەرپەری هێزوتوانایانەوە چوون بەگژی ئەو ناحەز و دوژمنانەی خیانەتیان بەم دینە كردوە و و درۆیان بەدەم پێغەمبەری خواوە كردوە ، ئەم زانا بلیمەت و خواناسانە ، بەكۆمەكی خوای گەورە هەموو هێزوتوانایەكی خۆیان خستە كار .. شەوڕۆژ .. ولآتەو ولآت دەربەسی هەژاری و برسێتی

نەبوون بەرگەی جۆرەها ناڕەحەتیان گرت ، عەودالی دۆزینەوەی فەرموودە صەحیحەکان بوون .. هەتا موسڵمانان بەدڵنیایی پشت بە قسەیان ببەستن و ئەحکامیان لێ وەرگرن .. لەڕاستیشدا کاتێك سەرنجی مێژووی ئەوزانایانە دەدەین کە خۆیان تەرخانکردوە بۆ بژار کردنی حەدیثەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرمان سوڕدەمێنێ لە بلیمەتی و لێبڕانی ئەو خواناسە بەڕێزانە کە ژیانی خۆیان وەك مۆم دە گڕاند هەتا ڕۆشنایی ببەخشن بەنەوەکانی داهاتوو .. بەرهەمی ڕەنجی دەیان ساڵەی خۆیان لەخەرمانی فەرموودە ( صەحیح وحەسەن ) ە کاندا کردە دیاری دەستیان و دووەم سەرچاوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان ڕۆشن کردەوەو پیلانی دوژمنانیان هەڵوەشاندوە ..

بەم شێوەیە دووەمین سەرچاوەی پیرۆزی ئیسلام لە فێڵ ومەکری ناحەزان قوتاری بوو .. بە بلیمەتی ووردبینی و سەلیقەی بێ سنوری ئەوزانایانە موسوڵمانان بونە خاوەنی چەندەها سەرچاوەو کتێب و نوسراوی گرنگ لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، لەڕاستی دا توێژینەوەی وورد و دروست و ئەکادیمیانە زۆر پێویستن و گەرەکە بنەماکانی توێژینەوەی زانستی و لێکۆڵینەوەی ووردبکرێت لە هەموو بوارەکانی ژیانیان چ لەڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەلآیەتی و ئەو کەش و هەوایەی کەتیایدا ژیانیان بردۆتە سە ر .. بەڵکو ژیانی ئەم خواناسانە لە ئاستێکدایە بکرێتە هەوێنی نامەی دکتۆرا و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی ، وەکو بەشێك لە بەر نامەی زیندوو کردنەوەی مێژوو کەلەپورو شارستانی ئیسلامی .. ئێمەش بەپێویستمان زانی بەرامبەر شەونوخونی و ڕەنج و زەحمەت و هەوڵی‌دەیان ساڵەی ئەو خواناسانە

چمكێك لە ژياننامەی چەند زانايەك بنوسين كە بونەتە مەشخەڵی ڕێگا و لەزانستی حەدیث دا هەمیشە وەكو مانگی چواردە درەوشاوەن و پرشەيان دێت ، هەتاكو پێكەوە شانازی بكەين ئێمە هەڵگری بيروباوەڕ و ئايدۆلۆژيايەكين كەڵەپياوی وا پێ‌دەگەيەنێ ..دڵمان خۆش دەبێ كاتێ دەزانين كەسانی وا بۆ خوا لێبڕاوانە كاريان كردوە و بەم شێوە ناوازەيە شەن وكەوی فەرمودەكانيان كردوە، تێ‌دەگەين چ خزمەتێكی گەورەيان بەم دينەی خوا كردوە .... پێويستە نەوەكانی ئيسلام بزانن كەئەم ئاينە هەروا بەئاسانی نەگەيشتۆتە لامان ،دەبا بەوەفابين بۆ هەوڵی ئەودڵسۆزانە كە ژيانی خۆيان بۆ خاتری گەياندن و پاراستنی پەيامی يەكتاپەرستی لە جيهان دا تەرخان كرد.. كەمترين وەفاداری ئێمە لەوەدا خۆی دەبينێتەوە كەهيچ نەبێت لەژيانی ئەوان شارەزابين.. بۆئەم مەبەستەش ئەم چەندلاپەرەيەمان تۆمار كردوە تا بەڵگەی خۆشەويستی‌و پێزانينمان بێ بەرامبەر ئەوكۆمەڵە مرۆڤەی كە شەوەزەنگی شەوگاريان بۆ ڕۆشن كردينەوە .. خوا گۆڕەكانيان پڕبكات لە نور .. ئێمەش لەو نورو ڕوناكی يە بێ‌بەش نەبين ..



# پێشەوای زانایانی حەدیث

# ﴿ ئیمام بوخاری ﴾

باوەڕ ناکەم ئەم ناوە غەریب بێت لامان کەم کەس هەیە ناوی ﴿ ئیمام بوخاری ﴾نەبیستبێت یان دڵی پڕنەبوبێت لە ئارامی کاتێ فەرمودەیەکی بینیوە یان بیستویەتی و لەبارەیەوە نوسراوە بوخاری ڕیوایەتی کردوە ، بەوە دڵخۆش نەبوبێ .. (ئاخۆ پێشەوا بوخاری کێیە ؟ بۆ هێندە ناودارو بەڕێزە ....؟ بۆچی دوای قورئان پشت دەبەستین بەو فەرمودە صەحیحانەی کە ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە ؟!

بوخاری : ناوی محمدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موغیرەیە.

کونیەی : ﴿ ئەبو عبدالله ﴾ یە لەبەر ئەوەی خەڵکی وڵاتی بوخارایە ناسراوە بەبوخاری .. ڕۆژی جمعە / ۱۳/ شوال / ۱۹٤ ی کۆچی لەوڵاتی بوخارا هاتۆتە دنیاوە .. ئیسماعیلی باوکی ئیمام محمدی بوخاری شارەزابوە لەحەدیثدا ، گەیشتۆوە خزمەتی﴿ عبدالله ی کوڕی موبارەك و گوێی لە مالیکی کوڕی ئەنەس بوە ﴾ ...

بوخاری کە باوکی مردوە هێشتا منداڵ بوە .. بەڵام خۆش بەختانە پارەو سامانێکی پاك و حەڵاڵ و زۆری بۆ بەجێ دەهێڵێ.. وەکو باوکی بوخاری لە سەرەمەرگدا دەڵێ :﴿ شك نابەم پارەوماڵم یەك درهەم حەرام یان شوبهەی تیابێت ...﴾ بۆیە بوخاری سودی وەرگرت لەم پارە و سامانەی باوکی و کاسبی نەکرد ، بەڵکو سەرقاڵی فێربوونی زانستی حەدیث بوو .. هەر بەمنداڵی لەگەڵ دایك و ئەحمەدی برایا حەجی ماڵی

خوایان كردووە .. بوخاری ماوەیەك لەشاری مەككە مایەوە بۆ فێربوونی زانست ..بەمندالی بوخاری بینایی چاوەكانی لە دەست دەدات ، دایكی لەخەودا ئیبراهیم پێغەمبەر﴿ علیە السلام ﴾ ئەبینێت ، پێی دەڵێ : ( دایكی بوخاری بە هۆی دۆعا زۆرەكانتەوە خواڕووناكی گێڕایەوە بۆ چاوەكانی كوڕەكەت ) بەم شێوەیە خوا ڕەحمی كرد بە بوخاری و چاوەكانی چاك بونەوە .

لە سەرنج داندا لە ژیانی ئیمام بوخاری ئەوەمان بە ئاشكرا بۆ دەرئە كەوێت كە بەڕاستی خوای گەورە ئەیەوێت عیزەت بدات بەم دینە .. ئیسلام پارێزراوبێت ، بۆ ئەم مەبەستەش كەسانی وا دەرەخسێنێت كە خاوەنی تایبەتمەندی گرنگ بن بۆ هەڵسوڕاندنی ئەركی سەرشانیان .. ئیمام بوخاری بەفەزڵی خوا خاوەنی توانایەكی زۆر بەهێز بووە لە ( حیفظ ولەبەر كردندا ) بۆ تەنها یەك جار سەیری هەرشتێكی بكردایە یەكسەر لەبەری دەكرد ..

﴿ حاشدی كوڕی ئیسماعیل ﴾ ئەڵێ : ئێمە كۆمەڵێك بووین ئەچووینە خزمەت زانایانی ( بەصرە ) بۆ وەرگرتنی حەدیث ، بوخاری منداڵبوو ، لەگەڵمان دەهات ، بەلام هیچی نەئەنوسی ، زۆر لۆمەمان كرد چونكە شانزە ڕۆژ بەردەوام ئە هات بۆ گوێ گرتن بەبێ ئەوەی هیچ بنووسێ، دوایی زۆر سەرزەنشتمان كرد .. وتی : زۆرتان ووت ، بێنن بزانم چیتان نووسیوە .. سەیرمان كرد ( ١٥) هەزار حەدیسمان نووسی بوو .. هەمووی لە بەر بۆ خوێندینەوە .... بێ ئەوەی هیچی نووسیبێ ...!

﴿ئەبوبەكری كلوزانی ﴾ ئەڵێ : كەسم نەدیوە ئەوەندەی ( محمدی كوڕی ئیسماعیل ) زیرەك بێ، كتێبێكی وەرئەگرت ، هەر ئەوەندەبوو

چاوی پیانەخشاند ، ئیتر هەمووی لەبەر ئەکرد ، بۆیە ناوو شۆرەتی زیرەکی وبلیمەتی ئاسۆی ئەم دونیایەی گرتۆتەوە ..

بوخاری ئەفەرموێ: هەموو مانگێ پێنج سەد درهەمم لە پەیداکردنی عیلمدا خەرج کردوە .. کەتەمەنم گەیشتە شانزە ساڵان کتێبەکانی ﴿ عبدالله ی کوڕی موبارەك و وەکیعی کوڕی جەڕاحم ﴾لە بەرکردوو بۆچونی (اهل الرأي ) م زانیوە...

## مامۆستاکانی ئیمام بوخاری

پێشەوا بوخاری چاوی کەوتووە بەهەندێ لە( تابیعی تابیعین ) و فەرمودەی لێیانەوە وەرگرتوە ، خۆی دەفەرموێ : لە هەزارو هەشتا کەسەوە قسەم وەرگرتوە و نوسیومە...

لەمامۆستا گەورەکانی ئیمام بوخاری :

١- ئەبو عاصم نەبیل ٢- ئەحمدیکوڕی حەنبەل

٣- ئوسامەیکوڕی مەنصور ٤- مەکیکوڕی ئیبراهیم

٥-ئەبو بەکری سلیمانی کوڕی بیلال ٦- عبیدالله کوڕی موسا

وەچەندەهای تر...

## قوتابیەکانی بوخاری

که خوای گەورە ناوبانگ و شۆرەتی بوخاری بڵند کردەوە .. زانیاری زۆری پێ بەخشی .. ئیتر ئیمام بوخاری هیچ جۆرە بە خیلیەکی نەکرد بەزانستەکانی ، هەرچی دەزانی بەوپەڕی دڵسۆزیەوە دەیگەیاندە قوتابیە کانی ، بۆیە لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیەوە پۆل پۆل خەڵك دەهاتنە خزمەتی و عیلمیان لێ وەردەگرت...

زانای حافظ﴿ صالح جەزرە﴾ ئەڵێ : محمدی کوری اسماعیل کە لەبغداد دائەنیشت ، لە مەجلیسەکەی‌دا زیاتر لە بیست هەزار کەس دائەنیشتن ..بۆیە ژمارە یەکی زۆر زاناو بلیمەت لەسەر دەستی ئەم زانا خواناسەدا دەرچوون وخزمەتیان کردوە بە دینی‌خوا ، لەوانە :

١- ئیمام مسلم ی نیسابوری ! خاوەنی کتێبی صەحیحی مسلم دارقوتنی ئەڵێ : ئەگەر بوخاری نەبوایە (مسلم)ی‌ی هاموشۆی نەدەبوو.

٢-ئیمام ( ئەبو عیسای تیرمزی ) ، خاوەنی کتێبی ( السنن) .

٣-ئیمام ( صالح ی کوڕی محمد ) ناسراو بە ( جەزرە ) .

٤-( ئیمام ئەبوبەکرکوڕی خوزەیمە) .

٥-( ئەبوداود) .

٦ -( ئەبوقاسمی بەغەوی ) .

٧-( ئیمام ئەبو محمد نەسەفی ) .

٨-( ئەبو عبد الله محاملی ) .. وچەندەهای تر

## گەشتەکانی ئیمام ﴿ بوخاری ﴾

گەشت و گەڕان .. ئاوارەی وڵاتان ، دروشمی زاناو خواناسان وقوتابیانی قورئان و فێرخوازانی زانست و ئەهلی حەدیث بووە .. بوخاری بەو ئەندازە عیلمەی کەوەری‌گرتوە لە بوخاراو دەوروبەری وازی نەهێناوە بەڵکو هەر لەتەمەنی ( ١٦) ساڵی‌یەوە کە لەگەڵ دایك و برا گەورەکەی دا چوون بۆ حەج ئیتر زۆر شوێن گەڕاوە بۆ پەیداکردنی زانیاری و گەڕان بەدوای فەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) .

ئیمام بوخاری لە ساڵی ٢١٠ واتە لەتەمەنی (١٦) ساڵیدا دەستی‌کردوە بە گەشت و گەڕان بۆ ئەم وڵاتانە :

١- خۆراسان ٢- بصره ٣- کوفە ٤- بغداد

٥- مەککەومەدینە ٦- شام ٧- میصر

٨-جزیرە ( نێوان دیجلەو فورات )

## زانستەکانی پێشەوا ﴿ بوخاری ﴾

بە هۆی زیرەکی و گەشتی زۆرو خۆ هیلاك کردنی بەردەوام ، ئیمام بوخاری بووە دارای زانست و بەهرەیەکی زۆر .. لە چەند زانستێکدا شارە زایی پەیداکرد .. چونکە پسپۆڕی بوخاری لە وردەکاریەکانی ( عیلمی حدیث ) دا بواری بۆ ڕەخساند هەتا لە زانستەکانی تردا شارە زابێت لەوانە :

١- زانستی حەدیث : لەم زانستەدا بوخاری گەیشتۆتە لوتکە .. یەکێك بووە لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوا لە بلیمەتی و شارەزاییدا ..بۆ نموونە : بوخاری خۆی دەڵێت : سەد هەزار حەدیسی صەحیحم لەبەرە .. دووسەد هەزار فەرموودەشم لەبەرە کە ناگەنە پلەی ( صحیح )

- ئەبوئەزهەر ئەڵێ : لە سەمەرقەند ، چوار سەد قوتابی حەدیس هەبوون، ویستیان بوخاری بخەنە هەڵەوە وئیمتحانی‌بکەن ، یەك هەفتە دانیشتن، هاتن رجالی اسنادەکانیان تێکەڵ دەکرد ..سەنەدی شامیان دەکرد بەسەنەدی عێراق و سەنەدی یەمەنیان دەکرد بە سەنەدی حەرەمەین، نەیانتوانی یەك هەڵەی لێبکرن ..

٢- زانستی ڕاڤەی قورئان ( التفسیر ): هەروەکو چۆن شارەزابوە لە سەنەدی فەرمودەکاندا بەهەمان شێوە زمانەوان و﴿ فەقیە﴾ بوە

بـە ئەحکامــەکانی قورئــان و بــەتواناوبوە لەتەفسـیردا.. موتــالآی کتێبــی ( التفسیر) ی دانراوی خۆی ،ڕاستی ئەم قسانە دەردەخات .

٣- زانستی فیقه: بەهۆی گرنگی دانی ئیمام بوخاری بەزانسـتی حـەدیث، پێویست بوو شارەزابێت لەفیقهدا بۆیە لە (١٨) ساڵی دا شارەزایی باشی پەیداکرد بەجۆرێك کە مامۆستاو زاناکان شایەتیان بۆ ئەدا .

﴿ نەعیمی کوڕی حەمادی خوزاعی ﴾ ئەڵێ : محمدی کوڕی اسماعیل فەقیهی ئەم ئومەتەیە ...﴿ محمدی کوڕی بەشـار ﴾ ئـەڵێ : کـە محمـدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری هات بۆ بەسرە وتم : ئەمڕۆ سەیدو گـەورەی فەقیهو زاناکان هات ..

پێشەوا بوخاری پەی بەشتی وا گرنگ بـردوە کـەزۆر کـەس سەرسامن تیایدا ئەمەش بەڵگەیە لە سەر زۆر زانایی ئیمام بوخاری لە بواری فیقهدا .

٤- زانستی مێژوو : هونـەری نووسین لـەم زانسـتەدا لای بوخاری بـوو .. پێشڕەو و ڕچەشکێن بوو تیایدا ... وەکو خۆی دەفەرموێت : لەتەمەنی هـەژدە ساڵیمەوە دەستم کرد بەنووسینەوەی کتێبێك لەسـەر هـاوەڵان و تـابیعین .. پاشـان کتێبێکـم لـە بابـەت مێـژوو نووسـی لــەنزیك ( قــەبری پێغەمبـەری خــوا (ﷺ) بەشــەوانی مانگەشــەو ئەمنووســیەوە .. کتێبــی ( التأریخ الکبیر ) بەڵگەی تواناداری بوخاری یە لەم بوارە دا .

٥- زانستی جەرح وتەعدیل : بوخاری مامۆستای ئەم زانستەیە ،هـەڵگری لیوای ئەم عیلمە قورس وزەحمەتەیە، کـەم کـەس هەیە بتوانێت هێنـدەی بوخاری لـەم زانسـتە گرنگـەدا شـارەزابێت .. بوخـاری زۆر بەمەترسـیەوە هەنگاوی ناوە و قسەی کردوە لەم زانستەدا بەهۆی وەرعـی زۆرو ترسانی بێ ئەندازەی لەخوای گەورە .

٦- زانستی عیللەتی حەدیث : وردترین و قورسترین زانستە لە حەدیث دا ، کتێبە مەزنەکەی ﴿ الصحيح ﴾ بەڵگەی زۆر شارەزاییەتی لەم عیلمەدا ، زۆر کەمن ئەوانەی پەی بەنهێنیەکانی بەرن، ئیمام بوخاری پاش ئیمام ﴿ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیبن مەدینی ﴾ زۆر لەم عیلمەدا شارەزابوە، ئیمام بوخاری ئەفەرموێت : لەبەر دەستی ( ئیبن مەدینی ) دا نەبێت خۆم بەبچوك نەزانیوە .بەڵگەیەکی تری شارەزایی ئیمام بوخاری لەزانستی﴿ عیللەتی حەدیث ﴾دا ئەوەیە کەزانای بلیمەت ﴿ ئیمام تیرمزی ﴾ لەگەڵ ئەوەشدا زۆر شارەزابوە لەعیللەتی حەدیسدا وە کتێبێکی هەیە بەناوی (العلل الكبير ) دەرچوی بەردەستی ئیمام بوخاری یە..!

٧- زانستی زمانەوانی : لەم زانستەشدا شارەزاو سەرکەوتوو بووە چونکە زمانزانی پێویستیەکی گرنگی ئەو کەسانەیە کە لەبوارێکی سەختی وەکو زانستی فەرمودەدا کاردەکەن .

## نوسراوەکانی ئیمام بوخاری

خۆشبەختانە پێشەوا بوخاری گرنگی داوە بەنووسینەوەی زانستەکانی خۆی بۆیە سەروەتێکی بە کەڵکی لەعیلم وزانستی حەدیث و بوارەکانی تر بۆبەجێهێلاوین لەوانە :

١-﴿ الجامع الصحيح ﴾ ناسراوە بە ﴿ صەحیحی بوخاری ﴾ .

٢- ﴿ التاريخ الكبير ﴾ ، زۆر بەنرخە ، باسی پیاوانی فەرمودە ئەکات لەسەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە هەتا زەمانی خۆی .

٣- ﴿ التاريخ الاوسط ﴾ .

٤- ﴿ التاريخ الصغير ﴾ .

٥- ﴿ الادب المفرد ﴾ .

٦- ﴿ خلق افعال العباد ﴾

٧- ﴿ رفع اليدين في الصلاة ﴾

٨- ﴿ الضعفاء ﴾ .. وچەند کتێبێکی گرنگی تر

## ئیمام بوخاری و شایەتی زانایان

١- قوتەیبەی کوڕی سەعید ئەڵێ : بوخاری لە زەمانی خۆیدا وەکو عومەری خەتتابە لەسەردەمی خۆیدا .

٢- ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرموێت : ( خۆراسان کوڕێکی‌تر وەکو بوخاری بەرهەم نەهێناوە..)

٣-ئیمام ئیبن خوزەیمە دەفەرموێت:( لەژێر ئەم ئاسمانە کەسم نەدیوە ، ئەوەندەی محمدی کوڕی‌ئیسماعیل لە فەرمودە پێغەمبەری‌خوا(ﷺ) شارەزابێت .

٣- ئیبراهیم ی کوڕی محمدی کوڕی سەلام دەڵێ : ( کەڵەپیاوانی ئەهلی حەدیث وەکو ( سەعیدی باوکی مریەم .. ئیسماعیلی کوڕی ئووەیس...

ئیبراهیم ی خوزامی .. محمدی کوڕی مەیمون .. وەچەندەهای تر ) لە محمدی کوڕی اسماعیلی بوخاری ترساون و سڵیان لەبلیمەتی و بەتوانایی لە حەدیث دا کردۆتەوە .

٤-(سلێمانی کوڕی حەرب ) جارێکیان سەیری ئیمام بوخاری کردو وتی ئەمە ناوبانگ پەیدا ئەکات .. !!!

٦- (عبدان مروزی )ئە ڵێت : تائێستا کەسم بەدی نەکردوە لەم کوڕە گەنج زەینی ڕۆشن تر بێت .

# مه قامی ئیمام بوخاری

چونکە ئیمام بوخاری ژیانی لە پەیداکردنی زانست و فەرمودەدا سەرف کردوه ، ئیتر نموونەی کەسی خواناس و بەتەقواو دینداربوه ، بەو زانستەی هەیبووە ئیشی کردوه ، زانستەکەی بلاوکردۆتەوه ، سیمای ئەولیاو پیاوچاکانی بەئاشکرا پێوە دیار بووە .. بۆیە زانستی فراوان وخواناسی زۆر بووەتە هۆی پەیداکرنی‌سام وهەیبەت ویقاری زۆروخۆشەویستی لەدلی خەلکی‌دا تائێستاش موسولمانان بەوپەری رێزەوە باس لەپێشەوا بوخاری دەکەن و ئاسەواری دلسۆزی و بۆ خواژیان لەنوسینەکان و ژیانی دا دیارە ...پێشەوا بوخاری زۆر نوێژی دەکرد، لەخوا ترس بوو .. زۆربەی کات قورئانی ئەخوێند .. جارێکیان لە نوێژدا (١٧) جار زەردەواڵە پێوەی دا بەبێ ئەوەی نوێژەکەی ببڕێت دوای نوێژەکەی زۆربەی گیانی ئاوسا‌بوو ..وتی :لەکاتی نوێژدا گەیشتمە ئایەتێك زۆر بەلامەوەخۆشبوو .. حەزم نەکرد نوێژەکەم ببڕم . هەندێك کەلو پەل دێت بۆ ئیمام بوخاری کۆمەڵێك بازرگان ئێوارە دێن بۆ ماڵی ئیمام بوخاری و ئەیانەوێت ئەو کەل وپەلانەی لێ بکڕن بە ( ٥) هەزار درهەم قازانج ، ئیمام بوخاری دەفەرموێت : تازە شەوە ، بڕۆن بەیانی وەرنەوە .. بەیانی کۆمەڵێ بازرگانی تر دێن بۆ کڕینی شتەکان بە (١٠)هەزار درهەم قازانج ئیمام بوخاری دەفەرموێت : وەعدم داوە بەکۆمەڵێکی تر پەشیمان نابمەوە ..، ئیمام بوخاری لەبەر ئەگەری کەوتنە گومان و حەرامەوە کڕین و فرۆشتنی نەدەکرد هەمیشە داوای لەکەسێکی تر دەکرد شتی بۆ بکڕێت یان بۆی بفرۆشێ.

## میحنەت و ناڕەحەتی ئیمام بوخاری

ئازارو ئەشکە نجەو تووش بوونی جۆرەها ناڕەحەتی و میحنەت سوونەتی خوایەو هەموو پیاوچاکان و خواناسان لەماوەی ژیانیاندا تووشی هاتوون و بەرگەی هەموجۆرە ناڕەحەتیەکیان گرتوە و بونەتە سەرمەشق و پێشەنگی خەڵکی ، نموونەی ئارامگری و خۆڕاگری بوون لەبەردەم ئاستەنگ و میحنەتەکاندا ،ئەوەی جێی سەرنجەو مایەی داخە ئەوەیە کە ئەم زانا بەڕێزانە زۆر جار بەهۆی بەناوموسڵمان و هاوەڵیحەسودو قین لەدڵەوە تووشی ناڕەحەتی هاتوون ، پێشەوا (بوخاری)ش یەکێکە لەو خواناسانەی کەلە ماوەی ژیانیدا بەتایبەتی تووشی دووکێشەی گەورە هات ،ئارام گرانە بەرەو ڕووی بوەوەو خوای گەورە سەرکەوتوی کرد :

١- میری بوخارا ( خالیدی کوڕی ئەحمەدی هەزلی ) پیاوێکی نارد بەدوای ئیمام بوخاری دا بەخۆی و کتێب و پێویستیەکانی بێنەخزمەت و مەجلیسی ئەمیرەوە باگوێی لێ بگرێت بەتایبەتی هەردووکتێبی ﴿ الجامع والتأريخ ﴾ وە ئەوانیتر،پێشەوا بوخاری بەنوێنەری ئەمیری بوخارای وت : من زانست زەلیل و سەر شۆڕ ناکەم.. نایبەمە بەر دەرگای خەڵکی با ئەمیر هەر پێویستی و پرسیارێکی هەیە بێت بۆ مزگەوتەکەم یان بێت بۆ ماڵمان، هەروەها بەئەمیری ڕاگەیاند ئەگەر قایل نابی و بەدڵت نیە قەدەغەم بکەو مەهێڵە لە مەجلیسدا ئامادەبم و زانست بگەیەنم بۆ ئەوەی بەڵگەم هەبێت بۆ قیامەت چونکە من عیلم ناشارمەوە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی هەرکەسێك لەزانستێکدا پرسیاریان لێکردو شاردیەوە لغاوی ئاگر دەکەنە دەمی لە قیامەت دا ، ئەمیری بوخارا لوت بەرزی گرتی وهانی بەناو چەند

زانایەکی‌دا تا قسە لەسەر مەزهەب و بیرو باوەڕ و زانستی بوخاری بکەن و تۆمەتی بۆ دروست کەن و هەوڵ بدەن ناوی بزڕێنن ولەڕێزی کەم بکەنەوە، لەبەرامبەریشدا ئیمام بوخاری دۆعای بەکۆمەڵی لێکردن ومانگی بەسەرا نەچوو خوا حەیای بردن و لەناو خەڵك دا شەرمەزارو ریسوابوون و خوای گەورە لەدونیادا تۆڵەی ئیمام بوخاری لێ سەندنەوە .

**٢- میحنـــەتی دووەم:** حەسـودی وحیقـد بەرامبـەر زانایـان و خواناسـان مێژینـەی کۆنـی هەیـە ، ئیمـام بوخـاری نـاوو شـوهرەتی لـە جیهانی ئیسلامی‌دا بڵاو بوەوە بۆیـە هـاوەڵانی خۆی حەسودیان بەم بڕە زۆرە عیلم و ڕێز وناوبانگەی بوخـاری برد.. لەسـەرەنجامدا فیتنەیـەکیان هەڵگیرساند بۆ ناوزڕاندن و سوك کردنی ئیمام بوخاری .. ئەبو حامدی ئەعمەشی ئە گێڕێتـەوەو ئەڵێ : ئیمام بوخـاریم دی لـە جـەنازەی ( ئـەبو عوسمـان سەعیدی کوڕی مـەروان )دا ئـەچوو بـۆ سـەر قـەبران ( محمـدی کوڕی یەحیا) بەرێوە پرسیاری قورس و گرانی ئاڕاستەی پێشەوا بوخاری ئە کرد لەناوو شوهرەت و عیللەتی حەدیث دا .. ئیمام بوخاری ئەوەندە گورج وئاسان وەڵامی محمدی کوڕی یەحیای ئەدایەوە، وەکو ( سورەتی الاخلاص ) بخوێنێ ..لەئەنجامدا محمدی کوڕی یەحیا حەسودی برد بەم هـەموو زانسـتە زۆرەی ئیمـام بوخـاری و درۆی بـۆ هەڵبەسـت لـەبارەی عەقیدەی ئیمام بوخاریـەوە ..پێشـەوا بوخـاری کتێبێکـی نووسـی بـەناو نیشانی ﴿خلق افعال العباد ﴾ کەجیاوازیی کردوە لەنێوان قسەوکردەوەی بەندەکان و قورئانی پیرۆزدا ، قسەو هەڵسو کەوتەکانی مـرۆڤ دروسـت کـراون ، بـەڵام قورئـان فەرمایشـتی خوایـەو مـەخلوق نیـیـە ..بۆیـە تۆمەتەکانی محمدی کوڕی یەحیا کە بەفیتی ئەمیری بوخارا هەڵیگیرساند

خامۆش بوو ئیمام بوخاری لەم میحنەتەش دا سەربەرزو سەركەوتوو رزگاری بوو ..

پاشان ئیمام بوخاری ئە فەرموێت : ئەم محمدی كوڕی یەحیایە بۆ ئەوەندە حەسودە بەعیلم و زانیاری ..مەگەر نازانێ عیلم رزق و ڕۆزیە خوای گەورەش خۆی چۆنی بوێت ئاوا ڕزقی بەندەكانی ئەدات .

## پێشەوا بوخاری « صەحیحی بوخاری » چۆن نووسی ؟ !

دوو هۆكاری سەرەكی هاندەری ئیمام بوخاری بوون بۆ دانانی كتێبی ( الجامع الصحیح ) كە بە صەحیحی بوخاری ناسراوە و بەرهەمی ڕەنج و بەڵگەی زەحمەت و زادەی زانستێكی فراوانە ، ئیمام بوخاری ئەفەرموێ : لە خەوما باوەشێنێكم گرتبوو بە دەستمەوە ، لە حزوری پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەستابووم و خزمەتم ئەكرد، لە هەندێ خەوناسم پرسی بۆ ماناكردنی ئەم خەوە ، ئەوانیش وایان بۆ ڕاڤەكردم گوایە من درۆ دوور ئە خەمەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) .. لە لایەكی ترەوە مامۆستای گەورەو زانای خواناس( ئیسحاقی راهەوەی )كە ئیمام بوخاری لە خزمەتیا زانستی فەرمودەو فیقه فێربوە ، بە قوتابیەكانی ئەڵێ :« بریاپەڕاوێكی پوختتان كۆبكردایەتەوەو سوننەتی صەحیحی پێغەمبەری خوای تیا بوایە » .. ئیمام بوخاری دەفەرموێت ئەم قسەیە لە دڵما جێ‌ی گرت ، بۆیە دەستم كرد بە نوسینەوە وكۆكردنەوەی ( الجامع الصحیح ) .

جێ‌ی سەرنجە ئیمام بوخاری دەستی‌كرد بە نوسینەوەو دانانی ئەم كتێبە بەنرخە بەفەرمودەی ( انما الاعمال بالنیات )،بە مەبەستی نیەت پاكی و دڵسۆزیەوە ، ئەمە جگە لەوەی كە خۆی ئە فەرموێت( لە كتێبی صەحیح دا هیچ فەرمودەیەكم نەنوسیوە،هەتا خۆم نەشۆردبێ ودوو ڕكات نوێژم نەكردبێ ) ..

صەحیحی بوخاری بەنیەتی خزمەت کردن بەپەیامی ئیسلام و خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وسازگارکردنەوەی سەرچاوەی دووەمی ئەم ئاینە پیرۆزەو پاش هەوڵ و ڕەنجێکی بێئەندازە هاتۆتە بەرهەم ، بۆیە هەتا قیامەت هەر بەرهەم دار ئەبێت و موسوڵمانان سودی لێ وەر ئەگرن و ماسی دەریاکانیش نزای خێر بۆ زانایان و ئەهلی عیلم ئەکەن .

## کۆچی دوایی ئیمام بوخاری

پاش بەسەر بردنی تەمەنێکی پڕ لە بەرەکەتی ( ٦٢) ساڵی ، پاش ئەوەی خوا دەستی ڕێزی نا لەم بەندە خواناسەی خۆی و زانستی زۆری پێ بەخشی و کردیە یەکێك لە سەربازەکانی خۆی بۆ پاراستنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و بژارکردنی فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاش نووسینەوەی هەزارەها فەرمودەی صەحیح و دانانی چەندین کتێب و پەڕاوی گرنگ ، پاش میحنەتی ئیمام بوخاری لەگەڵ والی بوخارادا ، ئیمام بوخاری بوخارای بەجێ هێشت و هاتە گوندی ﴿ خەرتەنگ ﴾ کەسەر بەناوچەی ( سەمەرقەندە ) ،هاتە ناو خزم و کەس و نزیکەکانی خۆی شەوێکیان گوێ یان لێبوو ئیمام بوخاری دوای شەونوێژ ئەپاڕایەوەو ئەیفەرموو ( خوایە دڵم سەغڵەتە .. زەوی لەبەر چاوم تەسك بۆتەوە ،بمبەرەوە بۆلای خۆت )مانگی بەسەرا نەچوو لەشەوی شەممە کەشەوی جەژنی ڕەمەزانی ساڵی (٢٥٦) کۆچی بوولەتەمەنی١٢ساڵ سیانزە ڕۆژ کەم دا ، بۆ دواجار چاوە ڕۆشنەکانی بەنووری عیلم و فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێك نا و گیانی پاکی دای لە شەقەی باڵ بۆ خزمەت ئەو پێغەمبەرە نازدارەی کە ئەم ژیانی تەرخان کرد بۆ پارێزگاری وبژارکردنی فەرمودەکانی خواڵێ خۆشبێت و لە بری موسوڵمانان پاداشتی چاکەی بداتەوە ..

# ﴿ پێشەوا موسلیم ﴾

لە کاتی باسکردنی زانایان و خزمەت گوزارانی فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی هەردوو پێشەوا ﴿ بوخاری و موسلیم ﴾ پێکەوە باس دەکرێن و ناویان هاوتای یەکترە و مۆری دڵنیایی فەرمودە ساخکراوەکان و صەحیحەکانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) .. بەڵکو لەهەندێ فەرمودەدا مۆری ( رواه الشیخان ) ، هەردوو ڕیش سپی و بلیمەتەکەی زانستی حەدیس ریوایەتیان کردوە ، مانای ساغ بونەوە و دروستی و بێگومانی ئەوفەرمودەیەیەومانای بژارکردنی زانستیانەیە ..

ناوی :( موسلیمی کوڕی حەججاجی کوڕی موسلیمی کوڕی وەردە )، کونیەی:(ئە بوحسەین )ە ، لەبەر ئەوەی نیشتەجێی شاری نیسابوربوە، سەربەولاتی خۆراسان ، پێی ئەوترێت : موسلیمی نیسابوری .. سالی ٢٠٤ یان وەکو هەندێك ئەڵێن سالی ٢٠٦ ی کۆچی هاتۆتە دنیاوە .. ئیمام موسلیم بالابەرزێکی سەرو ڕیش سپی بوە .. بەکاروباری بەزازی و قوماش فرۆشی یەوە سەرقاڵ بووە . پێشەوا موسلیم لە سەرەتای ژیانی منالی یەوە ، هەتا دوارۆژەکانی ژیانی بۆ فێربوونی زانستی حەدیث کەسەرچاوەی دووەمی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە تەرخان کرد .. ئیمام موسلیم ئەوەندەی گرنگی‌دا بە فێربوونی عیلمی حەدیث ، ئەوەندە گرنگی نەداوە بە فێربوونی زانستەکانی تر ،وەکو فیقه و تەفسیر و زمانەوانی ، هەرچەندە شارەزاییەکی باشیشی هەبوو لەم زانستانەدا .. بەلام ئیمام موسلیم ئەوەندەی لە زانستی حەدیثداهەلکەوتوو دیارو ناوداربووە ، لەو زانستانەی تردا وانەبووە ..

شایـەتی دانـی هەرسـێ زانـای شـارەزای بـواری حـەدیس ، وەکـو ( ئەحمەدی نیسابوری و ئەبوزەرعە و عەبدوڕەحمانیئەبوحاتەم ) لەبارەی بـالاٌ دەسـتی ئیمـام موسـلیمەوە ، بەڵگەیـەکی مـەزنی بـەتوانایی ئیمام موسلیمە لەحەدیث دا .

بەشێوەیەکی گشتی ئیمام موسلیم لەم زانستانەدا سوارچاک و پسپۆر بووە :

١-زانستی حەدیث :مەبەست لەم زانستە شارەزاییە لە فەرمودەکان .. دەقـەکانیان .. سـەنەدەکانیان .. زیادوکـەمی فـەرمودە .. جیاکردنـەوەی فەرمودەی ڕاست لەهەڵبەسراو ..هتد.. ..

ئیمام موسلیم سـوارچاکی ئـەم مەیدانـەبوە، چونکـە دوای پێشـەوا بوخاری کتێبیصـەحیحی ئیمـام موسـلیم دووەمـین سـەرچاوەی گرنگـی فەرمودەیە کەجێی بڕواو متمانەی زانایان بـێ .. لـە مـاوەی (١٥) پـانزە ساڵدا ئینجا ئیمام موسلیم لێبۆتەوە لەبژارکردنی فەرموده صەحیحەکان و نووسـینەوەیان لـە کتێبـی صـەحیحی خـۆی دا ، زانـای نـاودار ( ئیبن صەلاح )ئە فەرموێ ﴿ بەهۆی کتێبی صەحیحەوە خوای گەورە ئیمام موسلیمی بڵنـد کـردەوە بـە بـەرزایی ئەسـتێرەکان ، کـەبووە پێشـەنگ و حوجە و لە زانستی حەدیث دا ئەخوێنرێ﴾..

٢-زانستی پیاوانی فەرمودە : ئـەم زانسـتە بناغـەی زانسـتی حەدیثـە .. چونکە ( محدث ) واتـە : فـەرمودەزان بـۆ دڵنیـابونی لـە ڕەوشـتی ئـەو کەسـانەی کەفـەرمودەیان گێڕاوەتـەوە ، پێویسـتیان هـەبوە بـە فـێربوونی ئـەم زانسـتە .. هەتابتوانن ڕشتەی سەنەدی فەرمودەکان دیاری بکەن .. ئیمام موسلیم خاوەنی زەین ڕۆشنیەکی زۆرو سەرناسێکی وردبوە ، مێژوو ناوی زیندوان و مـردوان و شۆرەتیانی بەباشی ئەزانی .. لەم بارەیەشەوە بابەتی گرنگی نووسیوە ..

٣-زانستی جەرح وتەعدیل : ئەم زانستە تایبەتە بەرەخنەگرتن لەپیاوانی حەدیث.. جیاکردنەوەی ( سیقە ) و لاوازەکانیان .. ئیمام موسلیم لێزانانە دەستی داوەتە ئەم زانستە سەختەو کارامەبوە تیایدا ، لەپێشەکی کتێبی ( الجامع الصحیح )ەکەیدا هەندێکی لەم بارەیەوە نووسیوە ..

٤-زانستی عیللەتی فەرمودە : سەختترین و وردترین و پەنهانی ترین جۆرەکانی زانستی فەرمودەیە .. ئیمام موسلیم یەکێکە لەو زانابلیمەتانەی کە شارەزایی زۆری هەبووە لەم بوارەدا و زۆر شتی بەکەڵکی نووسیووە بۆ زیاتر ئاشنابوون لەزانستی عیللەتی‌حەدیسدا ..

## گەشتەکانی

گەشت و گەڕان ، شارەو شارو وڵاتەو وڵات ، ئاوارەیی و غەریبی ، نانی ئیسراحەت نەخواردن ، ژیانی غەریبایەتی ، ئەمانە دروشمی قوتابیانی زانست و رەویەی ئەوکەسانەیە کەخۆیان بۆ فیربونی عیلم یەك لاکردۆتەوە لەپێناوی تێگەیاندن وپێگەیاندنی‌خەڵکی‌دا هەموو ناڕەحەتیەکیان لا ئاسان بووە خوای گەورەش کۆمەکی کردون .. ئیمام موسلیم هەروەکو زانایانی پێش خۆی و سەردەمی خۆی شەوقی پەیداکردنی نووری زانست ئۆقرەی لێبڕی هەتا گەشتێکی گەورەی درێژخایەنی دەست پێکرد بۆ وڵاتانی جیهانی ئیسلامی ، لەو وڵاتانە ( خۆراسان .. عێراق .. حیجاز .. شام .. میصر .. هتد..)

ساڵی (٢٢٠)ی کۆچی کە ئەو سەردەمە هێشتا ئیمام موسلیم نەوجەوان بوو تازە خەتی‌ئەدا چوو بۆ حەج لەوێو لەشاری مەککە گەیشتە خزمەت ( عبدالله قعنبي ) و چەندین دەرسی لێوەرگرت بەڵام پاشان لە

ساڵی (٢٣٠)كۆچی گەشتێكیفراوانی درێژی دەست پێكردو ئەو وڵاتانە گەڕا كەپێشتر ئامارژەمان پێكرد .. ئینجا كۆچانی سەفەرو گەشتی بۆ یەك جاری داناو لەوڵاتی خۆی كە نیسابووره نیشتەجێبوو .

# مامۆستاكانی

بلیمەت وكارامەیەكی وەكو ئیمام موسلیم ، بێگومان ئەبێ پەروەردەكراو و دەرچووی بەردەستی چەندین زانای پایەبڵند بێت كە لە زانستی خۆیان ئیمام موسلیمیان بەهرە مەند كردوە، لە ئەنجامدا بوە ئەستێرەیەكی پرشنگداری ئاسمانی زانست و خواناسی لە مێژووی ئیسلام دا ..یەكێك لەو زانا بەرێزانەی كەدەستی خێریان هەبوە لەپەروەردەو پێگەیاندنی ئیمام موسلیمدا ، پێشەواو زانای خواناس و ناودار ( ئیمام بوخاری ) یە .. موسلیم وەكو سێبەر هەمیشە بەشوێن ئیمام بوخاریيەوە بووە هەرگیز بە جێی نەهێڵاوە ،ئیمام موسلیم زۆر قەدری ئیمام بوخاری مامۆستای ئەزانی جارێكیان موسلیم بۆ وەڵامی پرسیارێك لەبارەی عیللەتی فەرمودەیەكەوە هاتە خزمەت ئیمام بوخاری و نێوچاوانی ماچ كرد ..پاشان وتی : بهێڵە با قاچەكانت ماچ بكەم .. ئەی مامۆستای مامۆستاكان ،گەورەی فەرمودەناسەكان وپزیشكی عیللەتی فەرمودەكان ).

لەزاناكانی تر كەئیمام موسلیم شاگردو قوتابی بەردەستیان بووە :

١- عبدالله ی كوڕی مەسلەمەی قعنبی .
٢- ئیمام ئەحمەدی كوڕی حەنبەل .
٣- ئیسحاق ی كوڕی راهەوەی .
٤- یەحیای كوڕی مەعین .
٥- عبدالله ی دارمی .خاوەنی ( المسند )
٦ -ئیسحاق ی كەوسەج . .. وەچەندەها زانای تر ..

# قوتابیەكانی

سوننـەتی خـوا وایـە لـەزەویدا مەشـخەڵی زانسـت شـەرەفی هەڵگرتنی ئەدرێتە دەستی چەند كەسێك و پاشان ئەوانیش بەوپەڕی ڕێزو ئەمانەتەوە ئەو مەشخەڵە ئەپارێزن و تەسلیمی نـەوەكانی دوای خۆیـانی ئەكـەن ، بـەم شـێوەیە ژیـانی مـرۆڤ لەسـەر زەوی دا تـاریكی تـەنگی پێهەڵناچنێ و ڕۆشنایی زانستی خواناسان شەوی دەیجوورمان بۆ دەكاتە ڕۆژی ڕوناك، ئیمام موسلیم بەو زیرەكی و بلیمەتیە بێ ئەندازەی خۆی .. بەوهەموو زانستە زۆرەی خۆی كەوەریگرت لەمامۆستا دڵسۆزەكانی .. لەو هـەموو گەشت و زەحمەتانەی كەچەشـتی لـە ڕێی پـەیداكردنی عیلمـدا ، ئەمیش بە ئەمانەتەوە مەشخەڵی زانستی تەسلیم بە چـەندەها قوتـابی و شـاگردی دوای خـۆی كـرد ، ئـەوانیش دڵسـۆزانە پەیامەكـەی ئیمـام موسلیمیان گەیاند ، خوا پاداشتی هەموویان بداتەوە ..

لەو قوتابیە ناودارانەی كەبەردەستی ئیمام موسلیمیان كردوە :

١- ئەبو عیسای تیرمزی ، خاوەنی الجامع .
٢- ئەبو بەكری كوڕی خوزەیمە .. ناسراوەبە ( امام الأئمة )
٣- ئەبو عەوانەی ئیسفراییینی ، خاوەنی ( الصحیح )
٤- مەككی كوڕی عەبدان .
٥- صالح ی كوڕی محمدی جەزرە .
٦- ئیبراهیم ی كوڕی محمدی كوڕی سوفیان ..
٧- محمدی كوڕی عەبدولوەهاب فەراء .. وەچەندەهای تر .

## ئیمام موسلیم لە دیدی زانایان دا

شێخ( ئیسحاقی کەوسەج ) مامۆستای ئیمام موسلیم فەرمویەتی ( موسلیم ، لەخێر بێبەش نابین هەتا خوای گەورە تۆ بهێڵێت بۆ موسڵمانان ) ...( ئەبو یەعلای خەلیلی ) ئەڵێ : ( موسلیم لەوە مەزنترە چاکەکانی باس بکرێن ) ، ( صەنعانی ) ئەڵێ : ( موسلیم یەکێکە لە پێشەوایانی دنیا ) .

## کتێبەکانی ئیمام موسلیم

لە بواری حەدیس دا چەند کتێبێکی بە کەڵکی نوسیوە ، هەتا دنیا دنیایە موسوڵمانان سودی لێوەردەگرن ، لەوانە :

١- (**الصحيح**) : مەزنترین نوسراوی ئیمام موسلیمە، دووەم سەرچاوەیە دوای صەحیح ی بوخاری .

٢-( **الكنى والاسماء** ) : چاپ کراوە ..

٣-( **التمييز** ) ... وەچەند کتێبێکی تر کەدیار نەماون .

## پێشەوا موسلیم و صەحیحەکەی ..

ئیمام موسلیم شاگردو قوتابی ئیمام بوخاری‌یە، لەسەر دەستی ئەم زانا پایەبەرزو بلیمەتەدا دەرچووە و شارەزایی پەیداکردوە لە زانستەکانی حەدیسدا .. کاتێك پێشەوا بوخاری لێبوەوە لە کۆکردنەوە و نووسینەوەی صەحیحەکەی ( ئیمام موسلیم ) یش شوێن پێی ئیمام بوخاری مامۆستای گرتەبەر ئەمەش لەکاتێکدا بوو کەئیمام موسلیم گەیشتبوە ئاستێکی بەرز لە زانستی فەرمودەدا ، بە ئاسانی فەرمودە صەحیحەکانی لەوانەی تر جیادەکردەوە .. ئیمام موسلیم لە سەر داوای کەسێك

کەپرسیاری لێکرد هەستا بە کۆکردنەوەی صەحیحەکەی و ئەم کتێبە بەنرخەی لە کۆی (سێسەد هەزار) فەرموودە گوڵ بژێرکردوە و لەماوەی (١٥) ساڵدا ئینجا لێ بۆتەوە لەنوسینەوەی صەحیحی موسلیم .. ( ئەحمەدی کوڕی سەلەمە ) کە هاوەڵی ئیمام موسلیمە ، ئەڵێ لەگەڵ موسلیم دابووم ماوەی (١٥) ساڵ خەریکی نووسینەوەی صەحیحە کەی بوو .. شایەنی باسە ئیمام موسلیم زۆر بەگرنگیەوە صە حیحە کەی نوسیوەتەوە .. خۆی هیلاك كردوە لەم كارە گرنگەدا وەكو خۆی ئە فەرموێ: ( لەم مەسنەدەدا هیچ فەرموودەیەكم بێ بەڵگە دانەناوە وهیچ فەرمودەیەکیشم بێبەڵگە لێ لا نەبردوە ، وەئەم کتێبەم خستە بەردەستی ( ئەبو زەرعەی ) زانا هەر فەرمودەیەك ئەو ئامارژەی کردبێت بەعیللەت وناتەواوی تیایدا لام بردوە ،هەر فەرمودەیەکیش بەڕاستی زانیبێت هێلاومەتەوە، ئەگەر ئەهلی حەدیس دووسەد ساڵ حەدیس بنوسنەوە بێ نیاز نابن وهەر پێویستیان بەم مەسنەدە ئەبێت ) ...

## کۆچی دوایی

پرسیارێکیان لە ئیمام موسلیم کرد لە سەر فەرمودەیەك ، نەیزانی .. چووەوە بۆ ماڵەوە ، چوە ژورەکەی خۆیەوە و دەرگای داخست ، ووتی: باکەس نەیەتە ژوورەوە .. دەستی کرد بەگەڕان بە دوای فەرموودەکەدا ، پوشێك خورمایان بۆ هێنا بوو ، لەگەڵ سەیر کردنی کتێب وگەڕان بە دوای فەرمودەکەدا خەریکی خورما خواردن بوو ئەوەندە خەمی دۆزینەوەی ئەو فەرمودە بوو ئاگای لە خۆی نەما چەندێ خورمای خواردوە ، کاتێکی زانی پوشە خورماکەی تەواو کردوە !! بۆیە دوای ئەوە نەخۆش کەوت .. ئێوارەی ڕۆژی یەك شەممە / مانگی رەجەب /٢٦١ ی

کۆچی ، پاش تەمەنێکی پڕ لە خزمەت  چاوە مانوەکانی لێك ناو گەیشتە کاروانی زانایان و ئەولیاوخواناسان .. چوو بۆ بە هەشتی بەرین بۆ خزمەت پێغەمبەران و شەهیدەکان ، مردنی ئیمام موسلیم زەرەرێکی گەورە بوو بۆ زانستی فەرمودە و ئاینی پیرۆزی ئیسلام . کاتیخۆی وتراوە : مردنی زانایەك .. مردنیدونیایەکە .. خوالێی خۆش بێت .



# ﴿ ئیمام ئەحمەدی حەنبەل ﴾

نـاوی :ئەحمــەدی کـوڕی محمـدی حەنبـەلی کـوڕی هیـلالی کـوڕی ئەســەدە.. ناسـراوە بـە ( ئـەبوعبدالله ) دایـك وبـاوکی عــەرەبن .. لــە رەچەلەکدا لەگەڵ نەسەبی پێغەمبەری خوا (ﷺ)یەك دەگرنەوە .. لە (٢٠) ی ربیع الاول ی ساڵی /١٦٤ی کۆچی لە شاری بغداد لەدایك بووە .. هەر لەمنداڵیـەوە دایـك و بـاوکی مـردون ، واتـە بـەس لـە نەســەبدا لەگــەڵ پێغەمبـەری خـوا یـەك ناگرنـەوە ، بەڵکو وەکوپێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەنازی باوك و دایکی بێبەش بووە..

پێشـەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبـەل سەروەت وسامانی بـۆ نەماوەتـەوە لـە باووباپیرانیـەوە ، بەلأم شـەرەفی بنەماڵە و نەسەبی بـەرزو خانـەوادەی بـۆ ماوەتـەوە .. هـەر لەباوکیـەوە حـەزکردنی لـە جیـهاد بۆ ماوەتـەوە ..چونکـە محمدی باوکی لە کاتی جیهاددا گیانی سپاردوە ..

## ئیمام ئەحمەد و وەرگرتنی زانیاری

ساڵی ١٧٩، واتە کەئیمام ئەحمەد لە تەمەنی چوارده ساڵی دا بوو ، وێڵ و عـەوداڵی فێربوونی زانیـاری بوە و یـە کـەمین کـەس کەفـەرمودەی لێ وەرگرتوە ﴿ ئەبو حەنیفە ﴾ بووە .. لەهەمان ساڵدا واتـە لـە سـاڵی ١٧٩ ی کۆچیدا زانای ناودار ( عبدالله ی کوڕی موبارەك ) دێـت بـۆ شـاری بغـداد ، ئیمام ئە حمەد ئەچێتە خزمەتی تا زانیـاری لێ وەربگـرێ بەلأم ( عبـدالله ی کوڕی موبارەك)دەرئەچێ بۆ غەزای ڕۆم وئیمـام ئەحمـەد فریـای ناکـەوێ لە خزمەتیاعیلم وەرگرێ ..!! ئیمام ئەحمەد لە بغداد مایەوە تا ساڵی ١٨٢ کە ( هەیسەمی کوڕی بەشیر )ی مامۆستای کۆچی دوایی کرد ..

## گەشتەكانی

كۆچی دوایی ( هەیسەمی كوڕی بەشیر ) ئاماژەیەك بوو بۆ ئیمام ئەحمەد كەچیدی لە بغداد نەمێنێتەوە و ولآتان بگەڕێ بەدوای فێربوونی زانستی فەرمودەدا .. بۆیە ئەویش بۆ فێربوونی زانیاری و پڕكردنی هەگبەی زانستی فەرموودە ئەم ولآتانە گەڕاوە :

١- شاری كوفە.

٢- پێنج جار چوەتە شاری بصرە .

٣- شاری مەككە ،لەوێش چاوی كەوت بە پێشەوا شافیعی .

٤- یەمەن .

٥- میصر.

٦- عبادان .

٧- تەرتووس.

٨- واست.

شایانی باسە ، پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل ئەگەرچی زۆر لەولآتان گەڕاوە ، بەلآم بێپارە و بێئیمكانیات بوە .. زۆربەی ولآتان بەپێ گەڕاوە .. حەماڵی كردوە هەتا پارەپەیدا بكات بۆ گەشتەكانی و دابینكردنی ژیانی قوتابێتی ..هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا كە ئیمام ئەحمەد خاوەنی ( حافزە) و توانایەكی لەڕادەبەدەربووە بۆ لەبەركردنی قورئان و حدیث ، هەرچی بیستووە نوسیویەتیەوەو بەوە وازی نەهێناوە كەلەبەری بكات .. (ئەبوزەرعە ) ئەڵێ : ﴿ ئیمام ئەحمەد هەزار حەدیثی لەبەربووە﴾، ئەمە جگە لەوەی ئیمام ئەحمەد لە گەشتەكانیدا هەوڵی داوە فیقە فێرببێ وێڕای عیلمی حەدیث ..

## زانستەکانی ئیمام ئەحمەد

لە زۆربەی سەرچاوەکانی زانست ، عیلمی وەرگرتوە و بە توانا و شارەزابوە لە زۆر بەی زانستەکاندا ، بەتایبەتی کە ئیمام ئەحمەد لە گەورەترین شاری زانست و مەڵبەندی عیلم و عیرفاندا ژیاوە کە شاری بغدایە .. لە زانستەکانی ئیمام ئەحمەد :

١- زانستی زمانەوانی : لە زمانی عەرەبیدا زۆر بلیمەت وشارە زابووە خۆی ئەڵێ : ﴿ لەئەبو عەمری کوڕی عەلاء کە مامۆستاو پێش سپی زمانی عەرەبی بووە زیاترم نوسیوە لەسەر زمانی عەرەبی ﴾ .

٢- زانستی فەرمودە : کتێبی ( مسند الامام احمد )کە زیاتر لە ( ٣٠) هەزار فەرمودەی تیانوسیوە ، گرنگترین دانراوی ئیمام ئەحمەدە لەبواری زانستی فەرمودەدا .

ئیمام ئەحمەد بە عبدالله کوڕی ئەڵێت : ﴿ ئەم مەسنەدە لەبەر بکەو بیپارێزە چونکە ئەبێتە پێشەوای خەڵکی ..﴾

لە زانستەکانی تری حەدیث و (عیلمی جەرح وتەعدیل ) زۆر شارەزا بووە ، ( عبدالله ی کوڕی ئیمام ئەحمەد ) ئەڵێ : ﴿ ئەبو تورابی نەخشەبی هاتە خزمەت باوکم ، باوکم ئەیووت: فلان کەس سیقەیە ، فلان کەس زەعیفە ئەبو توراب ووتی : قوربان غەیبەتی زانایان مەکە ..ئیمام ئەحمەد لەوەڵام دا ووتی : قوڕ بەسەرت .. ئەمە غەیبەت نىیە ئەمە نەسیحەتە .

٣-زانستی عیللەتی حەدیس : زۆر شارەزابووە لەم زانستە قورسەدا .. هەتا لەپێداچونەوەی کتێبی ( المسند) دا بە ( عبدالله ی کوڕی ) ئەڵێ : ﴿ خەت بێنە بەسەر فلان حەدیسدا چونکە فلان عیلەتی تیایە ..﴾

# قوتابیەكانی

چەندەها پیاوی گەورەو زانای ناودار وخواناس قوتابیەتی پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەلی كردوە ، بەڵكوهەندێ لەماموٚستاكانی فەرمودەیان لێوەرگرتوە لەوانە :

١- ئیمام شافیعی ..

٢- عبد الرحمن ی كوڕی مەهدی ..

٣- وەكیع ی كوڕی جەڕاح .

ئەم زانایانە فەرمودەیان لێ ریوایەت كردووە :

١-ئیمام بوخاری . ٢- ئیمام موسلیم . ٣- ئیمام ئەبوداود .

٤- تیرمیزی . ٥- ئیبن ماجە . ٦- نەسائی .

ئە مە ویڕای ئەم زانا ناودارانە :

١-عەلی كوڕی مەدینی . ٢- یەحیای كوڕی مەعین

٣-ئەحمەدی كوڕی صالح .



# مەناقبی ئیمام ئەحمەد

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نموونەی زانای خواناس و پارێزکارو لەخواترس بووە .. لە خواناسی و خواپەرستی دا نموونەو پێشەوابووە ..عبدالله ی کوڕی ئیمام ئەحمەد بەم شێوەیە باسی باوکی ئەکات :﴿ باوکم بەڕۆژدا بەڕۆژوبوو .. پاشان بەپەلە بەربانگی ئە کردونوێژی عیشای ئەکرد و سەرخەوێکی ئەشکاند ، ئینجا هەڵئەسا ، دەست نوێژی ئەگرت و هەتا بەرەبەیان نوێژی ئەکرد، پاشان ڕکاتێ نوێژی ویتری ئەکرد .. ئەمەوێڕای ئەوەی کەئیمام ئەحمەد زۆر کەم خۆربووە ..خۆی ئەفەرموێ : ﴿ ترسان لە خوا وایلێکردم ئیشتهای خواردنم نەماوە ﴾..

زۆربەی دۆعاکانی ﴿ اللهم سلم سلم ﴾بوو .. لەگەڵ ئەوەشدا ئیمام ئەحمەد هەژار و نەداربووە .. پیاوێك ئەڵێ : چومە خزمەت ئیمام ئەحمەد وتم یارمەتیم بدە هیچمان نی‌یە ، ئیمام ئەحمەد پێنج درهەمی دا پێم وتی : ﴿ ئێمەش جگە لەم پێنج درهەمە هیچ شك نابەین ..!!﴾

## لەبارەی ئیمام ئەحمەدەوە ووتویانە

قوتەیبە ئەڵێ : ﴿ باشترین کەسی ئەم زەمانەی ئێمە عبدالله ی کوڕی موبارەکە ، پاشان ئەم کوڕە لاوەیە .. کەمەبەستی (ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە ) ،هەرکەسێکت بینی ئیمام ئەحمەدی خۆش بوێ ئەوە بزانە خاوەنی سوننەیە و حەزئەکات دیفاع لە سوننە بکات ..﴾

بەقوتەیبەیان ووت : ﴿ ئە حمەد لەتابیعین حساب ئەکەیت ﴾ ووتی ﴿ لە تابیعیە گەورەکانە ﴾ پاشان ووتی : ﴿ ئەگەر سوفیانی سەوری نەبوایە وەرع ئەمردو نەئەما .. ئەگەر ئەحمەد نەبوایە دین ئەمردو لەناو ئەچوو ﴾ .

٤- زانستی فیقه : بەسه بۆ زانایی وتوانایی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە بواری فیقه وشەرعدا کە ئیمام ئەحمەد قوتابی بەردەستی ( ئەبویوسف ) بووه .. شایانی باسه پێشەوا شافیعی زۆر کاری کردۆتە سەر ئیمام ئەحمەد بۆ بەهێزبوونی بواری فیقه لەگەڵ زانستی حەدیسدا ..

پێشەوا شافیعی مەدحی ئیمام ئەحمەد ئەکات و ئەفەرموێت : ئەحمەد پێشەوایە لە هەشت بواردا :

١- ئیمامە لەحەدیسدا . ٢- ئیمامە لە فیقهدا .

٣- ئیمامە لە زمانەوانیدا ٤- ئیمامە لە قورئان دا .

٥-ئیمامە لە زوهدودونیا نەویستی دا . ٦- ئیمامە لە هەژاری دا

٧-ئیمامە لە وەرع و پارێزکاری دا ٨- ئیمامە لەسوننەدا

٥- (علم الكلام ) قسەزانی : شارەزابووه لەم زانستەدا ، بۆیە ئامۆژگاری عبداللەی کوڕی ئەکات لەگەڵ ئەو کەسانەدا دانەنیشێ کە خەریکی عیلمی کەلامن و قسەیان لەگەڵدا نەکات .

هەروەها ئەڵێ : ﴿ لەگەڵیان دامەنیشە هەتا ئەگەر دیفاعیان لەسوننەش کرد ..!! ﴾ ئەمەش بەڵگەی شارەزاییەتی لەزانستی کەلامدا..



## مامۆستاکانی

لەگەشتە زۆرەکانی ئیمام ئەحمەدا بۆ فێربوونی زانیاری چاوی کەوتووەبەژمارەیەکی زۆر لە زانایان ، (ابن الجوزی ) ئەفەرموێت : ﴿ ئیمام ئەحمەد (٤) مامۆستای پیاوو مامۆستایەکی ئافرەتی هەبووە ﴾ لەوانە :

١- هەشیمی کوڕی بەشیر ، پێنج ساڵ لەبغدا لەخزمەتیا بووە .
٢- سفیانی کوڕی عەینە .
٣- ئیمام شافیعی .
٤- قازی ئەبو یوسف .
٥- وەکیعی کوڕی جەڕاح .
٦- ئیبراهیمی کوڕی سەعد .
٧- عبد الرحمن کوڕی مەهدی ، وەچەندهای تر.. ..

٢-عەلی کوڕی مەدینی ئەڵێ : ﴿ خوا غیرەتی دا بە ئەم دینە بەهۆی ئەبوبەکری سدیقەوە لەشەڕی هەڵگەڕاوەکاندا ..لەڕۆژی میحنەتیشدا عیززەتی بەخشی بەم دینە بەهۆی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە ﴾ .

## نوسراوەکانی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

ئەگەر پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دژی نوسینەوەی زانست خۆی و قسە بەپێزەکانی نەبوایە ئەوا ئێستا کتێبخانەی ئیسلامی زۆر دەوڵەمەندئەبوو ، چونکە ئیمام ئەحمەدجگە لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) قایل نەدەبوو هیچ شتێك بنوسرێتەوە .. لەگەڵ ئەمەشدا چەند بەرهەمێکی گرنگی هەیە لەوانە :

١- المسند ٢- العلل

٣- الناسخ والمنسوخ ٤- الزهد

٥- الاشربة ٦- الايمان

٧- الامامة ٨- كتاب الفتن

٩- كتاب فضائل اهل البيت ١٠-طاعة الرسول .. وچەندەهانوسراوی‌تر.

## میحنەت و ناڕەحەتی ئیمام ئەحمەد

هەتاسەردەمی (رەشید) دەوڵەتی ئیسلام لە سایەی عەقیدەیەكی پاك وبێ‌خەوشـــدا ژیـــانی ئەبردەســـەر ..بـــەڵام كـــە ( مـــأمون ) ی كـــوڕی ( هارونەرەشـيد )چووەســەر عەرشـی دەســەڵات ، تــەوژمی ( موعتەزیلــە و جــەهمی )یــەكان برەویـان سـەند ،ئـەو عـەقیدە لارەیـان بـڵاو كـردەوە كـە ( قورئـان مەخلوقــەو دروســت كـراوە ) ، لــە كـاتێكدا ئوممــەتی ئیسـلام لەسەرئەوە كۆكن كەقورئان فەرمایشـتی خـواو نیگـای پـەروەردگارە بـەڵام موعتە زیلەكان توانیان ( مأمون ) بەلای خۆیاندا ڕابكێشن ..

بۆیە خەلیفە فەرمانی‌دا ( تاقی كردنەوەی خەڵك وزانایـان بكرێـت )، خـەڵك و زۆربـەی زانایـان لـە ترسـی گیـانی خۆیـان ، لـە خـەمی ئـازارو ئەشكەنجەدا هاتنـە سەر ئەو ڕایەی خەلیفـەو موعتەزیلـەكان كـە قورئـان مەخلوقە !! بەڵام ئیمام ئەحمەد وەكو كەژێكی بڵندو سەركەش و دامەزراو ڕوو بەڕووی خەلیفە و جەلادەكان بوەوەو بڕوای وابوو سەلەف وپێشینانی ئەم ئوممەتە لەم بارەیـەوە قسـەیان نەكردوە ..!! قورئـان كەلامی خوایـە ! مەخلوق نی‌یە !

بۆیە ( مامون ) دەستوری‌دا ئازارو ئەشکەنجە بدرێت .. بەلأم ئیمام ئەحمەد پەشیمان نەبووەوە ! لە بەندینخانەدا توند کرا ، هەتا( مامون ) مرد .. پاشان ( معتصم ) هاتەجیٚی (مامون )لە(مامون )توندتر بوو .. زیاتر ئەشکەنجەی ئیمام ( ئەحمەد)ی‌دا هەتا دەستەکانی دەرچوون .. ئازارو ئەشکەنجەی زۆریان دا ، بە قامچی ئازاری جەستەی ئیمام ئەحمەدیان ئەدا موعتەزیلەکان بە(خەلیفە موعتەصەم )یان ئەووت : ( بیکوژە .. خوێنی لە گەردنی ئێمە .. خەلیفە ئەیووت : ( ئەحمەد شتێك بلێ با کەمیش بێ قایلم کە، بابەرەلأت کەم و ئازادبی بەس ئازاربچێژیت ) ! ئیمام ئەحمەد لەوەلأمدا ئەلێ: ﴿ گەورەی ئیمانداران : شتێکم پێبلێن .. بەلگەیەکم بدەنێ لەقورئان هەتا بیلێم و قەناعەتم پێبکەن ، من چۆن ئەتوانم لە خۆمەوە قسەبکەم .. هێندەی تریان لێدام هەتا لەسەر خۆم چووم .. هۆشم نەما ..

کاتێك چاوم هەلهێنا .. کەلەبچەکانی دەستم نەمابوو .. کاتێ نوێژی نیوەڕۆهات ..( ئیبن سەماعە) بەرنوێژی کرد ..منیش نوێژم کرد لە گەلیاندا بەجەماعەت ،پاشان( ئیبن سەماعە ) ووتی : هەموو گیان و جلەکانت خوێنە ، نەزیفت هەیە چۆن نوێژت کرد ؟ ئیمام ئەحمەد ئەلێ ووتم : کاتی خۆی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب بەخەنجەر لێیاندا ، نەزیفی کردبوو نوێژیشی کرد..!!

( ٢٨) مانگی رەبەق ئیمام ئەحمەد لە میحنەت و لێدان و سزاو ناڕەحەتی و منازەرەدا ئەژیا .. سووربوو لەسەر ڕای خۆی کەقورئان کەلامی خوایەو مەخلوق نیە .. پاش ئەم (٢٨) مانگە لەزیندان ولێدان پێشەوا ئەحمەد ئازادکرا .. کەم کەم ئیمام ئەحمەد شیفای بۆ ئەهات و چـــاك

ئەبووەوە ، بەڵام شوێنەواری تەعزیب ولێدان وئەشکەنجە بە لاشەی پیرۆزیەوە دیاربوو ئیمام ئەحمەد گەڕایەوە بۆ زانستی حەدیث و فتوادان هەتا دەوڵەتی ( معتصم ) لەناوچوو .. بەڵام ( واسیق) جێی باوکی گرتەوە .. ئەویش هەمان ڕای هەبوو کە قورئان مەخلوقە و بڕیاری دا کەمندالآن ئەم عەقیدەیە بخوێنن ... ... بەڵام پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و چەند زانایەکی‌تر دژ بەم بڕیارەی خەلیفە ﴿ واثق ﴾ هەڵوێستیان گرت ... خەلیفە ﴿ واثق﴾ فەرمانی دەرکردو نامەیەکی نووسی بۆ پێشەوا ئەحمەد ﴿ نابێ لەگەڵ کەسدا کۆببێتەوە .. بۆ کوێ ئەچی بچۆ .. لە شارێکا نەبیت کە منی تیابم !!! ﴾

بۆیە ئیمام ئەحمەد ناچار لەماڵەکەی خۆیدا مایەوە .. تەنانەت بۆ نوێژیش نەدەهاتە دەرەوە .. هەتا خوا ( واثق)ی لەناوبرد لە ساڵی (٢٣٢) کۆچی‌دا .. پاشان ﴿ المتوکل ﴾ پۆستی خەلیفەی موسڵمانانی وەرگرت بڕیاریدا ئەم میحنەتە هەڵبگرێت لە سەر ئیمام ئەحمەد و ئازادبکرێت ...

بەڵێ خوێنەری ئازیز .. خوای گەورە ئەم دینەی خۆی پاراست لەڕۆژی شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا بەهۆی ﴿ ئەبوبەکری صدیقەوە ﴾، لەڕۆژی میحنەشدا ئەم دینەی ڕزگارکرد بەهۆی ئیمام ﴿ ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە﴾، ئەمەش باجی پێشەوایەتی و ئیمامەتی‌یە .. بەڵام پاداشتی ئارام گران لای خوای گەورە لە ژماردن نایەت .

﴿ انما یوفی الصابرون اجرهم بغیر حساب ﴾ .

# مەسنەدەکەی ئیمام ئەحمەد

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ﷺ) هەر لە هەرەتی لاوێتی یەوە سەرگەرمی فێربوونی زانستی فەرمودەبووە ، بە تایبەتی کەئیمام ئەحمەد لە سەردەمێکدا ژیانی ئەگوزەراند کە گەڕان بە دوای زانست و زانیاری‌دا باوی سەردەم بوو ،خەڵکی خەریکی خۆ پڕچەك کردن بوون بەچەکی زانست و توێژینەوە لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) .

بلیمەتی ئیمام ئەحمەد و توانای بێ ئەندازەی لەبواری (حیفظ)و لەبەرکردندا ئەوهەلەی بۆ ڕەخساند ببێتە سوارچاکی مەیدانی حەدیس و سەرکەوتوانە گرەوبباتەوە .لە کاتێکدا کەچەندین کتێبی فەرموده هەبوون بەڵام هێندە بابەتی تری تێکەڵ بووبوو ، شایستەی ئەوەنەبوون بکرێنە سەرچاوەو پشتیان پێ ببەسترێت ..

بۆیە ئیمام ئەحمەد بە سەلیقەی جوانی خۆی دەستی کردبە نوسینەوەی ( مەسنەدەکەی خۆی ) وبە شێوازێکی نوێ و جوان هەستا بەئەنجامدانی ئەم کارە پیرۆزە ، ئەگەرچی مەرگ مۆڵەتی نەدا و مەسنەدەکەی تەواو نەکرد ... ﴿ عبدالله ی کوڕی ئیمام ئەحمەد﴾ بەسەر سوڕماویەکەوە لەباوکی ئەپرسێ ، ئەوە چۆن بڕیارت دا ئەم مەسنەدە بنوسیتەوە ؟ لە کاتێك قایل نەبووی چەندین کتێبی تر دابنێی ؟ ئیمام ﴿ ئەحمەد﴾ یش لەوەڵامدا ئە فەرموێت :﴿ ئەم پەرتووکەم نووسیوە هەتا ببێتە پێشەوای خەڵکی ، هەتا ئەگەر مەردمەکان لەشتێکدا کۆك ویەك ڕانەبوون بگەڕێنەوە بۆ ئەم مەسنەدە ﴾ ..

بەم شێوەیەو هەروەکو ﴿ حـافظ ئەبو موسـای مـەدینی ﴾ ئـەڵێ :
﴿ مەسنەدی ئیمـام ئەحمـەد ئەسـڵێکی گـەورە و سـەرچاوەیەکی بـاوەڕ پێکراوە بـۆ ئـەهلی حـەدیث ، لـە ژمارەیـەکی زۆر فـەرمودەوە هـەڵبژێراوە بەشێوەیەك کەبوەتە پێشەواو جیِّی متمانەی خەڵك و لەکاتی فرەڕایـی دا باشترین پەناگەوپاڵپشتە ﴾.

# کۆچی دوایی

صالحی کوڕی ئیمام ئەحمـەد ئـەڵێ:﴿ ڕۆژی یەکـەمی ربیـع الاول ساڵی (٢٤١) کۆچی ، باوکم تـادای گـرت ، بەزەحمـەت هەناسـەی ئـەدا .. خەڵکی کۆمـەڵێك ئـە هـاتن هـەواڵیان ئەپرسـی و دوعایـان بـۆ ئـە کـردو ئەچونـە دەرەوە ..کۆمـەڵێکیتر ئـەهاتن ، پاشـان وەسـیەت ئـەکا بـۆ کوڕەکـانی و کـەس و کاروموسـوڵمانان لەسـەر دینـداری و خواپەرسـتی لانەدەن و خوا بە تاك وتەنها بناسن ..

پاشـان وەسـیەتی کـرد کـە قـەرزەکانی ببژێـرن و هەریـەکێ لـە دوو کوڕەکەی (صالح و عبدالله ) ( ١٠) درهـەمیان بدرێتـێ لـە میراتەکەی ...!!!
ڕۆژی جومعە ، ١٢/ ربیع الاول (٢٤١ ) کۆچی وەفاتی کرد ..

لەمەراسیمێکی گەورەو شکۆدارو بێ وێنـەدا کـە هـەزار هـەزار پیاو و ( ٦٠) هـەزار ئـافرەت ئامادەی بوون ، بەڕێ کرا بـۆ سـەر قـەبران لەشـاری بغداد .. دانیشتوان دەرگایماڵەکانیان ئەکردەوە و بانگیـان لـە خـەڵکی ئـە کرد :﴿ کێ ئەیەوێ بێت دەست نوێژ بگرێت ..! ﴾

# پێشەوای بەهەیبەت مالیكی كوڕی ئەنەس

ناوی :﴿ مالیكی كوڕی ئەنەسی كوڕی مالیكی كوڕی ئەبوعامرە ﴾ ناسراوە بە ئەبو عبداللە ، دوونەسەبی هەیە ﴿ الاصبحی ﴾ چونكە سەر بەخێڵی ﴿ ذواصبح ﴾ ی ناوچەی ﴿حیمیەر ﴾ی یەمەنە .. هەروەها پێی ئەوترێ﴿المدنی﴾ چونكە نیشتەجێی شاری مەدینەبووە .

## لەدایكبونی

پێشەوا مالیك ساڵی (٣٩)ی كۆچی هاتۆتە دنیاوە .. ئەو ڕۆژەی كەصەحابی بەڕێز ﴿ ئەنەسی كوڕی مالیك ﴾ لە دونیا دەرچوە .. ئەوەی جێی سەرنجە لێرە دا ئەوەیە كەپێشەوا مالیك ﴿ ٣﴾ ساڵ لەسكی دایكی‌دا ماوەتەوە ئینجا هاتۆتەد نیاوە ..!!

مالیكی كوڕی ئەنەس بالاَ بەرزێكی بە شان و شكۆو هەیكەلی بوە .. چاوشین بوە ، سەری ڕوتاوەبوە .. ڕدێنی پڕبوە ..سەروریشی سپی بوە .. هەمیشە جلی پاكی لەبەر كردوە ..جلەكانی نەرم وسپی‌بوون ...زۆر جارجلەكانی ئەگۆڕی ، هەرجارەی جۆرەجلێكی لەبەركردوە ..عەمامەی لەسەركردوە ..بەمیسك و جۆرەكانی تری عەتر خۆی بۆن خۆش كردوە ..

پێشەوا مالیك لەدەوڵەمەندی و پارەداری دا ژیاوە .. بۆیە هەمیشە جوانی و نیعمەتی پێوەدیاربوە .. زۆر گرنگی بەخۆی داوە بەم شێوەیە ئەوەندەی تر شیرین و كامڵ دەركەوتوە چونكە وێڕای خوڕەوشتی جوان و ئەدەبی بەرزو زانستی زۆر و قیافەی جوان ،گرنگی بەخۆی داوە و لەناو خەڵكی‌دا خاوەنی پلەو مەقامێكی بەرزبوە .

## نوسراوەکانی ئیمام مالیک

کتێبی ﴿ الموطأ﴾ بەناوبانگترین دانراوەکانی پێشەوا ﴿ مالیکە﴾ .. کتێبی ﴿ الموطأ﴾ ئەوکتێبەیە کەلەسینەی زۆربەی ﴿ حافظ﴾ەکاندا پارێزراوە .. زانایانی فیقهی ئیسلامی پشتیان پێبەستوە وەکو سەرچاوەیەکی گرنگی فیقهی ئیسلامی، بەڕاستترین کتێب دادەنرێت کە پێش هەردوو صەحیحی ﴿ بوخاری وموسلیم ﴾ نوسرابێ.

هەروەها پێشەوا مالیك خوالێ رازیبێت چەندین نوسراوی تری هەیە لەوانە : ١-﴿ رسالة في القدر ﴾

٢-﴿ رسالة في النجوم ومنازل القمر ﴾

٣- ﴿ كتاب السر ﴾

٤-﴿ جزءفي التفسير ﴾ .. وەچەندەها کتێبی تر ...

هەرچەندە پێشەوا مالیك دارای توانایەکی بەهێزبوە لە( حفظ و زانیاری ) دا بەلآم هیچ گەشتێکی نەکردوە، بەو بڕە زانیاریەی کە لەبواری فەرمودەکانی پێغەمبەری خوادا لە حیجاز فێری بوە قەناعەتی کردوە . لەگەڵ ئەوەشدا هەر پێشڕەویەتی و پێشەوایەتی شایستەی بەدەست هێناوە بەڵکو لەتەمەنی ﴿٢١﴾ساڵی دا بوو کە ئامادەیی ﴿ فتوادان ﴾ ی تیابوە و دانیشتوە بۆ فتوادان ...ئیمام مالیك لەتەمەنی (١٣) ساڵیدا دەستی کردوە بەپەیدا کردنی زانیاری و شەیدای عیلم وزانین بوو بەتایبەتی کەهەردوو زانای تابیعی﴿ القاسم کوڕی محمد و سالمی کوڕی عبدالله ﴾کۆچی دواییان کرد . ئیمام مالیك هەر بەمنداڵی حەجی کردوە، گەیشتۆتەخزمەت ﴿ عەتای کوڕی ئەبورەباح ﴾ کەهاوەڵی﴿ ئیبن عەبباس ﴾بوە .

پێشەوا مالیك خاوەن كەسایەتیەكی قورس ودامەزراو بوە .. ژیرو بە سەلیقەبووە، هەر لە منداڵیەوە خوای گەورە لە تێگەیشتن و لەبەر كردنی زۆر بەشی داوە .. دەستی كردوە بە فێربوون و زانیاری وەرگرتن . بەنیەتێكی دروست و بە مەبەستی خۆپارێزی و سوود وەرگرتن نەك ناوبانگ و شوهرەت پەیدا كردن .. خۆی ئە فەرموێت ﴿ هەرگیز عیلم فێر نەبووم بۆ خۆم نەبێ، هەوڵم نەداوە عیلم فێربم هەتا خەڵك ئا تاجیان پێم هەبێ ﴾ ..

## قوتابیەكانی پێشەوا مالیك

پێشەوا مالیك هێشتا لاو بووە كە زۆر بەی قوتابیانی زانست لە ولآتانەوە ئەهاتنە خزمەتی بۆ وەرگرتنی زانیاری و حەدیس و فیقهی ئیسلامی ، هەر لە ڕۆژەكانی ﴿ ئەبو جەعفەری مەنصور ﴾ ە وە هەتا سەردەمی خەلافەتی ﴿ هارون الرشید ﴾ ..

لەو كەسانەی كە فەرمودەیان لێوە ڕیوایەت كردوە :

١- محمدی كوڕی شیهابی زوهری .

٢- یە حیای كوڕی سە عیدی ئە نصاری .

٣- ئەبوسوهەیلی نافع كوڕی مالیك كە ( مامەی ) ئیمام مالیك بوە .

٤- ئیمام ئەبو حەنیفە .

٥- وەكیعی كوڕی جەڕاح .

٦- پێشەوا محمدی كوڕی ئیدریسی شافیعی .

٧- عبدالله ی كوڕی موبارە ك .

٨- سوفیانی سەوری .

٩- لەیثی كوڕی سەعد .. وەچەندەهای تر .

قوتەیبەی کوڕی سەعید ئەڵێ : ﴿ کاتێك ئە چوینە خزمەت مالیك ، مالیك ئەهاتە مەجلیسەکەوە بەجوانترین شێوەخۆی گۆڕی بوو ، خۆی بۆن خۆش دەکرد .. باشترین جۆر جلی لە بەردەکرد ، ئینجا دەستی دەکرد بەوتنەوەی دەرسەکانی .

پێشەوا مالیك نموونەی کەسی چاك و عیبادەت باش بوە ، هەرچەندە نوێژو ڕۆژوی زۆر نەبوە . .. بەڵام زۆر پارێز کاربوە . وەرع و پارێزی زۆر بوە ، سنوری خوای نەدەشکاند .. فەرمانی دەدا بە چاکەو حەق بێژ بوە .. قورئان خوێن بوە ..

پێشەوا مالیك ئەیووت : ﴿ تەلاقی زۆرە ملێ ناکەوێ ﴾، زۆریان پێ ووت پەشیمان بێتەوە ، کۆڵی نەدا ﴿ جەعفەری کوڕی سولەیمان ﴾ کە ئەمیر و فەرمان ڕەوای مەدینە بوو ، دایە بەر قامچی، ئازاری دا تادەستی دەرچوو ، سواری حوشترێکیان کرد ، بۆ ئەوەی ئابڕوی بەرن و سووکی کەن وتیان : خۆت بانگ بکە و ناوی خۆت بەرە .. ئەویش بەئازارەوە لەسەر پشتی حوشترە کەیەوە ئەیوت : ﴿ هەر کەسێ ئەمناسێ ئەوا باشە .. هەر کەسێ نامناسێ بابزانێ من مالیکی کوڕی ئەنەسم ،ئەڵێم تەلاقی زۆرە ملێ ناکەوێ ﴾، کاتێك ئەم هەواڵەیان گەیاندە ئەمیر ( جەعفەری کوڕی سولەیمان ) وتی : فریاکەون ، دایگرن بەسە بائەوەندە نەڵێ..!! دوای ئەوە ئیمام مالیك ئەبینرا لە مەجلیسدا بەدەستەکەی تری دەستەدەرچوە شکاوە سەقەتەکەی هەڵ ئەگرت ..بەڵام ئەم میحنەتەبووە هۆی بەرزبوونەوەی پلەوپایەی ئیمام مالیك لایخواو ڕێزی زیاد لای خەڵکی .

## لەبارەی مالیکەوە وتوویانە

پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس (ﷺ)هێندە خاوەنی پلەو پایەو فەزڵی گەورەیە ، هەموو ئومەتی ئیسلامی یەك ڕایان هەیە لەسەری ئەویش گەورەیی و فەزڵی ئەم پێشەوا خواناس و بلیمەتەیە بۆیە پێویست بەشایەتی‌کەس ناکات لەبارەیەوە ، بەڵام ئەمە ڕای هەندێك لەکەڵە زانایانە لەبارەی پێشەوا مالیکەوە .

١-پێشەوا مالیك لەبارەی خۆیەوە ئەڵێ : ﴿ فتوام نەداوە هەتا حەفتاکەس شایەتیان بۆ زانایم نەدایە ﴾ .

٢-پێشەوا شافیعی‌ئەڵێ : ﴿ مالیك مامۆستامە، لەوەوە عیلم و زانیاریم وەرگرتوە ﴾.

٣-سوفیانی کوڕی عەینە ئەڵێ : ﴿ مالیك زانای ئەهلی حیجازە ، حوججەتی زەمانی خۆیەتی ﴾ ..

٤-ئەوزاعی ئەڵێ : ﴿ مالیك زانای زاناکان و موفتی هەردوو حەرەمە ﴾

## مامۆستاکانی پێشەوا مالیك

پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس گەیشتوە بەخزمەتی کۆمەڵێ لەتابعین کە لەهاوەڵەکانی پێغەمبەری خواوە زانیاریان وەر گرتوە، لەو بەڕێزانەش ﴿ نافیع کە خزمەت کاری ئیبن عومەر ﴾ بووە، مالیك خاوەنی پلەیەکی بەرزبووە لای نافیع ،مالیك ئەڵێ:

﴿ هەرچەندە منالْ بووم ، تەمەنم کەم بوو ، بەڵام کە ئەچوومە خزمەت نافیع لەسەر پلیکانەکە ئەوەستاو قسەی لە گەڵدا ئەکردم ﴾..

جگە لەنافیع ، چەند مامۆستایەکی تری هەبوو ، لەوانە :

١- هیشامی کوڕی عوروەی کوڕی زوبێر .

٢- یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری .

٣- عبدالله ی کوڕی دینار .

٤- ئەبو زەینات عبدالله ی کوڕی زەکوان ... وەچەندەهای تر ....

## مەقام وپلەی ئیمام مالیک

ئەبــو موســعەب کــەهاوەڵی پێشــەوا مالیکــە ئــەڵێ : ﴿ خــەڵکی قەرە باڵغیان دروست ئەکرد ،شان شانێنیان بوو لەبەر دەرگای مالیک دا .. هەمیشە لـەوەڵام دا ئـەیوت: بـەڵێ .. نـەخێر . بـەبێ ئـەوەی کـەس لێی بپرسێت لەکوێوە ئەم وەڵامەت هێنا . !﴾

پێشەوا عبدالرحمن کوڕی مەهدی کەقوتابی ئیمام مالیك بووە ئەڵی: ﴿ هیچ کەسم نـەدیوە بەقـەدەرمالیك خـاوەنی هەیبـەت بووبێـت .. کـەس نی‌یـە هێنـدەی مـالیك ژیـرو عـاقڵ بێـت ، ئەگـەر وەڵامـی پرسـیارێکی نەدایەتـەوە لـەترس و هەیبـەتی ئیمـام مـالیك کـەس جورئـەتی نەئـەکرد پرسیارەکە دووبارە بکاتەوە ..سوڵتان و فەرمان ڕەواکان هەمیشە سڵیان لێ دەکـردەوەو لێی دەترسـان، وەکـو ئیمـام مـالیك خـۆی ئەفـەرموێت : ﴿ کەچومەتەلای هەرپاشـایەك خـوا هـەموو تـرس و هەیبـەتێکیانی لـەدڵم لابـردوەو لێیـان نەترساوم ﴾ ... ئیمام مالیك هێندە بە ڕێـزو گەورەییـەوە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوای دەگێڕایەوە ، هەتا دەست نوێـژی نەبوایـە فەرمودەی‌پێغەمبـەری خـوای بـاس نـەدەکرد .. مەجلیسـی ئیمـام مـالیك مەجلیسی ویقار وهێمنی بوە .. پیاوێکی نەبیل و بەڕێزبوە .

هەرگیز دەنگی بەرز نەئەبیسترا لەمەجلیسی دا ،مەجلیسەکانی دووربوون لە ڕوپامایی و قسەی بێکەڵك .. هەیسەمی کوڕی جەمیل ئەڵێ:گوێم لێ بوو (٤٨)پرسیاریان کرد لە ئیمام مالیك ، ( ٣٢) جاریان ووتی نازانم ..

## زانستە کانی ئیمام مالیک

مالیك خاوەنی پلەی پێشەوایەتی ڕەهابوە .. هەردوو زانستی ﴿ وەحی ﴾ لەبەربووە ، فەقیهو شارەزابوە تیایاندا .. لەبواری حەدیس دا سوار چاکی مەیدانی حەدیس بوە ، بەڵکو سەرکردەی سوارچاکانی زانستی حەدیس بووە .. سەنەدی حەدیسەکانی ئیمام مالیك ڕاسترین سەنەدە .﴿ مالیك لە نافیع و لەئیبن عومەرەوە ﴾ ئەمە زنجیرەی ئاڵتونی پێ ئەوترێت لە ڕیوایەت کردنی فەرمودەدا ... کەسێك لە پلەی ﴿ سیقە ﴾ دانەبوایە ، مالیك فەرمودەی لێ وەرنەدەگرت ، نەگوێی لەهەمووکەسێ ئە گرت .. نەقسەی هەموو کەسێکی ئەگێڕایەوە .. هاوەڵەکانی شایەتی وردبینی زۆریان داوە بۆ پێشەوا مالیك . ئەوەتا ﴿ سوفیانی کوڕی عەینە ﴾ کەپێشەوای ئەهلی مەککەیە ئەڵێ : ﴿ بەر ڕەحمەتی خواکەوێ مالیك ، ئای کە توندبوە لەڕەخنەگرتندا لەوپیاوانەی فەرمودەیان ڕیوایەت کردوە ﴾ .. هەروەها ئە یوت: ﴿ دڵنیام دوای کۆچی مالیك مەدینە وێران ئەبێت ..عالمی تیا نامێنێ ﴾ پێشەوا شافیعی لە قوتابیە بەڕێزە نەجیبەکانی ئیمام مالیك بوە ئەفەرموێ : ﴿ مالیك ئەگەر گومانی بکردایە لە فەرمودەیەك هەموی ڕەد ئەکردەوە ﴾ لە بواری فیقهو شەرع دا بێ وێنەی سەردەمی خۆی بوە ..

کەس نەبوە شان بدات لەشانیمالیك هەتا گەیشتە ئاستێك بوو بەیەکێك لەپێشەوایانی فیقە کەزۆربەی خەڵکی شوێن مەزهەبەکەی کەوتن

و پشتیان پێ بەستوه .. ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەفەرموێ : ﴿ مالیك پێشەوای حەدیس و فیقهه ﴾ زانای خواناسیش ﴿ نەزری کوڕی عەبدول جەببار ﴾ ئەڵێ : دوای﴿ رەبیعه ﴾ تەنها ئەولاوە﴿ ئوسبوحی‌یه ﴾ هەیه ﴿ مەبەستی ئیمام مالیکه ﴾ کەخاوەنی ڕەئیی‌پێکراو بێت .

## موطأی مالیک

ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس لەتابیعی تابیعینه ،گەیشتۆته خزمەتی کۆمەڵێ لەتابیعین و زانایانی مەدینه .. ئەو سەردەمەش ، سەردەمی ڕاپەڕین و هەڵمەتی نوسینەوەی سوننەبوو ..بۆیه ئیمام مالیك هەستا بەنوسینەوەی﴿ الموطأ﴾ ..

خەلیفه ئەبوجەعفەری مەنصور بەئیمام مالیکی کوڕی ئەنەسی ووت : ﴿ کتێبێك بنووسه هەتا من خەڵکی ئیجبار بکەم که پەیڕەوی بکەن ..﴾ ئیمام مالیك دوو دڵبوو لەم کاره ، بەلاَم ئەبو جەعفەری مەنصور وتی : ﴿ بینوسه هیچ کەسێك نی‌یه نه مرۆ لەتۆ زاناتربێت ﴾.. بۆیه ئیمام مالیك دەستی کرد بەنووسینەوەی ئەم کتێبه ، تازه خەریك بوو تەواو ئەبوو لەنووسینەوەی ، ئەبو جەعفەری مەنصور کۆچی‌دوایی کرد .. هەروەها ئەبوجەعفەری مەنصور بە ئیمام مالیکی ووت : ﴿ ئەم زانسته له کتێبێك دا بنوسەوه ، بەلاَم خۆت بەدوور بگره لەتوندوتیژیەکانی ئیبن عومەرو ئاسان کاریەکانی ئیبن عەبباس ، میانه ڕەوانه بینووسەو هەرچی هاوەلاَنی پێغەمبەری خواو ئیمامەکان لەسەری ڕێك کەوتوون بینووسه تیایدا ...﴾

جێ‌ی سەرنجه هەر ئیمام مالیك دەستی کرد به نوسینی کتێبی﴿ الموطأ﴾ چەندین کەسی تر لەمەدینەدا دەستیان دایه نووسینەوەی فیقهو دانانی

كتێب لەبابەتی كتێبەكەی ئیمام مالیك ..بۆیە هەندێ كەس بەئیمام مالیك یان ووت : بۆ هێندە خۆت هیلاك دەكەیت ؟ خۆ ئەوە چەندین كەسی تر خەریكی نووسینەوەی كتێبی لەم بابەتەن ئیمام مالیك فەرموی:﴿ بیانهێنن با بیانخوێنمەوە بزانم چیان نووسیوە ..؟!﴾ پاشان فەرموی : بەدڵنیاییەوە بۆتان دەرئەكەوێ هەركارێك بەمەبەستی ڕەزامەندی خوا نەكرابێ پایەدارو بڵند نابێ ..!! كەچی ئەو كتێبانە جگە لەكتێبەكەی ئیمام مالیك هەروەكو خرابنە ناو بیرەوە ، هیچ دەنگوباسێكیان نەما و كەس نازانێت چیان لێ بەسەر هات ، ئەمەش بەڵگەی دڵسۆزی ئیمام مالیكە ، كەلە ماوەی چل ساڵدا ئینجا لێبوەوە لەنووسینەوەی ﴿ موطأ﴾.

## كۆچی دوایی ئیمام مالیك

پاش نەخۆشیەك كە﴿ ٢٢﴾ ڕۆژی خایاند، لەمانگی ڕەبیعولئەوەڵی ساڵی﴿ ١٧٩﴾، پاش تەمەنێكی پڕلە بەرەكەتی ﴿ ٨٦﴾ ساڵی، پێشەوا مالیكی كوڕی ئەنەس گیانی پاكی سپاردو لەسەر وەسیەتی خۆی جلێكی سپییان كردە كفنی و لە گۆڕستانی﴿البقیع﴾ بەخاك سپێردرا ...

# پێشەوا نەسائی

ناوی :﴿ ئەحمەدی کوڕی شوعەیبی کوڕی عەلی کوڕی سینانی کوڕی بەحرە ﴾ ، بە( ئەبو عبدالرحمن ) بانگ دەکراو شۆرەتی (نەسائی ) بوو ، چونکە لەشاری ( نەسا ) کەشارێکە لەشارەکانی خۆراسان لەدایك بووە ، ئیمام نەسائی سالّی (٢١٥) ی کۆچی هاتۆتە دنیاوە .. پیاوێکی زۆر جوان و هەڵکەوتوو بوە .. دەم وچاوی بەوێنەی چرا پرشەی هاتووە .. بەهەیبەت و خاوەن ویقار بووە .. نەسائی زۆر گرنگی بەخۆی داوە .. هەمیشە حەزی لە خواردنی خۆش و جل وبەرگی جوان بووە ، دووجار پێشەوا نەسائی پۆستی قازێتی دادگای وەرگرتووە ،جارێکیان لەمیسر و جارێکیان لە حیمص لەولاّتی شام ..نەسائی هەر لەمناڵیەوە دەستی کردوە بە وەرگرتنی زانیاری ، لەتەمەنی (١٥) ساڵیدا واتە لە ساڵی ( ٢٣٠) ی کۆچی چوو بۆ ( بەغلان ) بۆ خزمەتی ﴿ قوتەیبەی کوڕی سەعید ﴾ ساڵێك و دوو مانگ مایەوەو بڕێکی زۆر زانستی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە ..زۆر زیرەك وبەتوانابووە ، لەتێگەیشتن و حیفظدا وێنەی کەم بووە ... هاوکات زۆر وورد کارو بەسەرنج بووە ..چووەتە خزمەت زانا مەزنەکان ، لە مەجلیسی پێشەواکاندا ئامادەبووە ، زۆر فەرمودەی لەبەرکردوە ، زۆری تریشی نووسیوە .. هەتا بوو بە پێشەواو پێشڕەو لە زانستی فەرمودەدا .. بەتایبەتی کە بەنیەتی پاك و بۆخواسوڵحانەوە دەست بەکاربوو ، ئیتر ئەستێرەی پێشەوا نەسائی لە درەوشانەوەدا بوو لە ئاسمانی زانست دا جێی سەرنجە پێشەوا نەسائی ڕچەشکێن بووە لە بواری نووسینەوەی ئەو حەدیثانەی کە ( زەعیفن ).

هەروەکو چۆن فەرموودە صەحیحەکانی نوسیوەتەوە ..ئەویش بۆ ئەوەی وریابین و لە ڕەخنەگرتنندا خاوەنی بەڵگەی ئاشکراو دیاربین ، نەك بە مەبەستی کۆمەڵ کردنی فەرموودەکان ..پێشەوا نەسائی خاوەنی عەقیدەیەکی دروست و دوور لەبیدعەبوە .. نوسراوەکانی بەڵگەن لەسەر عەقیدەی بێ خەوشی ئەم زاناخواناسە ..خوڕەوشتی جوان بوە، بەردەوام بەشەو و ڕۆژ خەریکی عیبادەت بووە .. ڕۆژ نا ڕۆژێك بەڕۆژوو بوە .. زۆر پەیوەست بوە بە حەج و جیهادەوە .. هەمیشە لە خەمی چاکسازی دابوە .. خۆی پاراستوە لە نزیك کەوتنەوە لە دەرگای سوڵتان و فەرمان ڕەواکان ..

﴿ محمدی کوڕی موسی ی مأمونی ﴾ هاوەڵی نەسائی ئەفەرموێ :﴿ بیستم هەندێك کەس ڕەخنەو تانەو تەشەریان ئەگرت لە پێشەوا نەسائی، چونکە کتێبی ( الخصائص )ی نوسیوە ، کە تایبەتە بە فەزڵ و بڵندی مەقامی پێشەوا ( عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ) (ﷺ) ، بەلاّم فەزڵ وچاکەکانی هەردوو گەورە و ڕیش سپی ( ئەبوبەکر و عومەر ) ی نەنوسیوە .. ئەمەم عەرزی ئیمام نەسائی کرد ، لە وەلاّمدا فەرموی : کاتێك چوومە شاری دیمەشقەوە بینیم زۆربەیان تووشی لادان بوون و لەبارەی (عەلی) یەوە خراپ ئەڵێن ، ( الخصائص ) م نووسی بەو هیوایەی خوا هیدایەتیان بدات ..

پاشان نەسائی کتێبی ( فضائل الصحابة ) ی نووسی ..

## گەشتەکانی

نەسائی گەشتێکی فراوانی کردوە ، بەدوای فێربوونی زانیاری دا .. لەم گەشتەیدا وڵاتانی ئیسلامی لە ڕۆژ هەڵاتەوە بۆ ڕۆژ ئاوای تەیکردووە و لە زاناو حافیزەکان سوودی وەرگرتوە .. لە وولاّتانەش :

١- خۆراسان .

٢-عێراق ( بغداد ، كوفه، بەصره )

٣- وولاتی شام

٤-حیجاز .

٥-جەزیره .

٦- ثغور ( سنووری ولاتی شام لەگەڵ رۆم دا ) .

٧- پاشان نەسائی لەمیصر سەقام گیر بوو له ( زقاق القناديل ) .

## نوسراوەكانی

نەسائی هەموو زانستەكانی لە دوو تووێی نوسراوەكانی دا تۆمار كردوه ، كه هەندێ لەو نوسراوانه بەگەنجینە وسامانێكیگەورەی ئیسلام و موسوڵمانان دائەنرێت و مایەی سود و قازانجە بۆ نەوەكانی موسوڵمانان له جیهاندا ، ئەمه وێرای ئەوەی كه ناو و شوهرەتی پێشەوا نەسائی بەرزو پیرۆز راگرتووه به درێژایی زەمانە .. نوسراوەكانی نەسائی زۆرن ، بەلام هەندێكیان ون بوون و دیار نین ..

﴿ ئیبن كەثیر ﴾ دەفەرموێ : ﴿ له نوسراوەكانی نەسائی دا ووردەكاری و راستگۆیی و ئیمانداری و زانست و عیرفان و حیفزی بێ ئەندازەی ﴿ نەسائی﴾ مان بۆ دەرئەكەوێت لەونوسراوانەش :

١- ﴿السنن الصغرى ﴾، لای هەندێك لەزانایان به ( المجتبى ) ناسراوه وبەیەكێك له شەش بنەماكانی فەرموده دائەنرێت .

٢- ﴿السنن الكبرى ﴾، هەندێكی چاپ كراوه .

٣- ﴿الكنى ﴾، دەست نووسه.

٤-﴿ خصائص على﴾ / چاپ کراوه .

٥-﴿عمل اليوم والليلة﴾ / چاپ کراوه .

٦-﴿التفسير﴾ / چاپ کراوه .

٧-﴿الضعفاء والمتروكون﴾ / چاپ کراوه .

٨-﴿تسمية فقهاء الامصار﴾./چاپ کراوه .

چەند نوسراوێکی نەسائی کە ونبوون و سۆراخیان نی‌یە:

١-﴿ مسند على بن ابى طالب﴾

٢-﴿ اسماء الرواة والتميز بينهم ﴾.

٣-﴿ الجرح والتعديل﴾

٤-﴿ الأغراب ﴾

٥-﴿ الأخوة ﴾

٦-﴿ مسند حديث مالك﴾

## مامۆستاکانی

نەسائی ، وەکو قوتابیەکی گوێ ڕایەڵ ، گوێ بیستی فەرمودەبوە و لەم زاناخواس و بلیمەتانە ، کەئەمە ناوی هەندێکیانە ﴿ ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەی ، هیشامی کوڕی عەممار ، بیشری کوڕی هیلالی صەووان ، یەحیای کوڕی موسی، عیمرانی کوڕی موسای قەزاز ، ئیسحاقی کوڕی شاهین، البزار ، مجاهدی کوڕی موسی‌ی، یوسفی کوڕی عیسی‌ی زوهری ﴾ وەچەندەهای تر ..

# قوتابیەکانی

ئەم زاتە بەرێزانە ، لە پێشەوا نەسائی‌یەوە فەرمودەیان ریوایەت کردوە : ﴿ابو بشر الدولابي ، ابو جعفر الطحاوي ، الأسيوطي ، عبدالكريم النسائي ، ابو بكرابن الحداد الشافعي ، حمزة بن محمد الكناني ، سليمان بن احمد الطبراني ،..﴾ وەچەندەهای تر ..

## نەسائی وشایەتی زانایان

ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستاو زانایانی هاوشانی ئیمام نەسائی‌و قوتابیەکانی شایەتی پێشڕەوی و ئیمامەتی و زاناییان داوە بۆ ئەم ئیمامە خواناسە ، بۆ نموونە :

١-﴿ حافز ئەبو عەلی نیسابوری ﴾ قوتابی نەسائی ئەڵێ : ﴿ نەسائی لە پێشەوایانی موسوڵمانان بوو﴾..

٢-﴿ ئەبو بەکر حەدادی شافیعی ﴾ قوتابی ئیمام نەسائی ئەڵێ : ﴿ نەسائیم قبوڵ کردوە وەك ( حوجەیەك ) لە نێوان خۆم و خوای گەورە دا ﴾ ..

٣-زەهەبی ئەڵێ : ﴿ نەسائی دەریای زانست وتێگەیشتن و بینایی‌و ورد بینی و رەخنە گرتن و باش نووسینە ﴾ ..

٤-﴿ دارە قوتنی ﴾ ئەڵێ : ﴿ ئەبو عبدالرحمن لە هەموو ئەو کەسانەی لە بواری فەرمودەدا کاریان کردوە لە پێشترە ﴾ ..

## میحنەتەكانی

پێشـەوا نەسـائی وەكـو هـەموو پیـاوە گـەورە و ماقوڵـەكانی ئـەم میللەتـە ، وەكـو زانـا ومەشـخەڵ دارانـی ئیسـلام و موسـوڵمانان ، لەتانـەو تەشەر .. ئازار ونەشكەنجە ومیحنەت وناڕەحەتی بێ بەش نەبووە ، بەهۆی حەسـودی ناحەزانـەوە تووشـی كێشـەو تـەنگ وچەڵەمـە هـاتووە ..بۆیـە تۆمـەتی﴿ تەشـەیوع ﴾واتـە شـیعەگەرێتیان دایـە پـاڵی ، لـە ئـەنجامدا ناڕەحـەتی و خەفـەتێكی زۆریـان بـۆ دروسـت كـرد كـەبوە هـۆی لـەدنیا دەرچوونـی ، هۆكەیشـی تەنها ئەمەندە بوو كە ئیمام نەسائیچوە وولآتـی شام بینـی خەڵكی لەوێ لایان داوە وزیادەڕەوی ئەكـەن لـە خۆشەویسـتی مەعاویـــــــەدا (ﷺ)پـــــــتر لــــــە خۆشەویســــــتی ئیمــــــام ﴿ عەلی كوڕی ئەبوتالیب ﴾ (ﷺ)..

بۆیە بەباشـیزانی كتێبێك بنوسێت تیایدا باس لە فـەزائیل وپلـەو مـەقامی عـەلی بكـات ، هـەتا بگەڕێنـەوە ڕەویـەی ئـەهلی سـوننەت و لەو ڕاستیە لانەدەن كەپلەو پایەی ئیمام عەلی هێنـدە بەرزە ، دوای هەرسـێ هـاوەڵی گەورە ﴿ ئەبو بەكر وعومەر وعوسمـان ﴾ فەزڵی كەسـیتر بدرێـت بەسەریا.. ئیمام نەسائی ، كتێبی ﴿ الخصائص ﴾ ی نووسی و زۆر لێزانانە باس لە مەناقبی ئیمام عەلی ئەكات ..دوای ئەم كتێبە ، هەستا بەنوسـین ﴿فەزائلی هاوەڵآن ﴾ بۆ ئەوەی تۆمەتی شیعە گەرێتی نەدرێتەپاڵ، بەلآم باسی معاویەی تیانەكردوە .. ناحەزانی ئەم زاناخواناسە بەردەوام بوون لەسەر ئاشـوب نانـەوە وفیتنـەچێتی هـەتا ئیمـام ﴿ نەسـائی ﴾ یـان لەمزگـەوت وەدەرنا وبەرەو مەككە شار بەدەریان كرد ، لەوێ بەنەخۆشی گیانی پاكی سپارد ..

﴿ حافز ئیبن عەساكر ﴾ ئەڵێ : ﴿ ئەم باسە بەڵگەی ئەوەنی یە ( ابوعبد الرحمن ) باوەڕی باش نەبووە بەرامبەر ( معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان ) بەڵكو تەنها ئەوەندەیە باسی نەكردوە .

## زانستەكانی ئیمام نەسائی

نەسائی خاوەنی زانست و ڕۆشنبیریەكی فراوان بوە لەشەریعەت دا ..قورئانی لەزانایانی قورئانەوە وەرگرتوە .. گوێ بیستی فەرمودەكان بووە لەئەهلی حەدیسەوە ..بۆیە بوە دارای زانست و مەعریفەی هەمەچەشنە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دا ، لەو زانستانە :

١- زانستی فەرمودە : لە بلیمەتەكانی ئەم زانستەبوە ..تەنانەت شان شانێنی لەگەڵ بوخاری‌دا كردوە. .هەتا گەیشتە ئاستێك بووە پێشەوای خەڵكی و دەفری زانیاری،لەگەڵ تێگەیشتن و مەعریفەی فراوان لەگێڕانەوەی فەرمودەو ڕاویەكان .. بەباشترین شێوە تەحقیق و بژاری كردوە .. فەرمودە صەحیحەكانی جیاكردەوە و بەچاكترین شێوان پۆلێنی فەرمودەكانی پێغەمبەری خوای كردوە (ﷺ) .

٢-زانستی سەرناسی و جەرح و تەعدیل : لەم هونەرەدا كەم وێنەبووە .. بەجوانترین شێوەو دەستەواژە ( جەرح و تەعدیلی ) ئەكرد و ڕوونی ئەكردەوە .. زۆربەی زانایانی دوای خۆی پشتیان بە ستووە بەتێبینی و قسەكانی .. نەسائی زۆر توندبوە لەڕەخنە گرتن لەڕاویەكان . تەنانەت لە ئیمام ( بوخاری و موسلیم ) مەرجی سەخت تری داناوە .. نەسائی لەم زانستەدا لەو پەڕی وردكاری و ئیحتیات كردندابووە ، ﴿ ئەبو یەعلای خەلیلی ﴾ ئەڵێ : ﴿ قسەكانی نەسائی پشتی پێ دەبەسترێت لە جەرح و تەعدیل دا ﴾ ..

٣-زانستی عیللەتەكانی فەرموودە : نەسائی مەلەوانی دەریای قوڵی ئەم زانستە بووە .. ئەوپەڕی شارەزایی تیاهەبووە .. بە توانابوە لە زانینی پەنهانیەكانی ئەم زانستەدا .. شارەزایی فراوان لە ڕێگاكانی گێڕانەوەی فەرمودەو پلەی ڕاویەكان زۆر پێویستە بۆ فێربوونی ئەم زانستە و بەهرەمەندبوون لێی ..

٤-زانستی فیقه : ﴿ دارقوتنی ﴾ ئەڵێ : ﴿ نەسائی شارەزاترین فەقیهی میصر بووە لە سەردەمی خۆیدا ﴾ ..

﴿ حاكم ﴾ ئەڵێ : ﴿ نەسائی لەفیقهی فەرمودەدا زۆری وتووە .. هەر كەسێ دیققەت بگرێ لە سونەنەكانی سەرسام ئەبێ لەقسەكانی... نەسائی دەرنەكەوتوە سەر بە یەكێك بێت لەمەزهەبە فیقهی‌یە ناسراوەكان هەرچەندە شافعی‌یەكان لەخۆیان حسابی ئەكەن چونكە لە میصرا ژیاوە و لە هاوەڵانی شافیعی فیقهی وەرگرتوە بەڵام پێ‌ئەچێ لەسەر ڕەویەی ئەهلی حەدیث بێ..

## سونەنی نەسائی

ئیمام نەسائی یەكێكە لە كەڵەزانایانی ناودارو بەهرەدار لە زانستەكانی حەدیثدا ..لەم زانستەدا ئەركی زۆری كێشاوە ، نوسینی زۆری تۆمار كردوە ، لەهەموونوسراوەكانی گرنگتر كەپوختەی زانستەكانی نەسائی‌یە كتێبی﴿ سونەنە ﴾ .. هەرچەندە لای زانایان ئەم كتێبەكراوە بەدوو بەشەوە ، یە كێكیان ناسراوە بە ﴿ السنن الصغرى ﴾ و ئەوی تریان بە﴿ السنن الكبرى﴾ ناسراوە ..

﴿ محمدی كوڕی معاویەی كوڕی ئەحمەر ﴾ ئە لێ : نەسائی وتویەتی :

﴿ کتێبی سوونەن زۆربەی صەحیحە ، هەڵبژاردەی ئەم کتێبە کەناوی ( موجتەبایە ) هەمووی صەحیحە ﴾ .

﴿ ئیبن ئەثیر﴾ لە ( جامع الاصول ) دا ئەڵێ : ﴿ هەندێك لەفەرمان ڕەواکان لە نەسائییان پرسی : ئایا کتێبی ( سوونەن ) هەموی صەحیحە ؟ ، ئەویش ووتی : (نەء) .. وتیان باشە هەرچی صەحیحە بۆمان جیابکەرەوە وبینوسە .. ئەویش ( موجتەبا ) ی نووسی ..هەر فەرمودەیەك عیللەت لە سەنەدەکەیدا بووبێ نەینوسیوە تیایدا..

## کۆچی دوایی

پاش تەمەنێکی پڕلەبەرەکەتی (٨٨) ساڵی کەزۆربەی ژیانی لە خزمەت کردنی پەیامی یەکخواناسی و پابەندبوون بە سەرچاوەی پاکی ئەم دینەوە .. پاش میحنەت و ناڕەحەتی زۆر کە ناحەزان بۆیان هەڵبەست وەکو ﴿ دارە قوتنی ﴾ ئەڵێ ﴿ دوای میحنەتەکەی داوای کرد بیبەن بۆ مەککە ..بەنەخۆشی گواستیانەوە بۆمەککە و لە مانگی صەفەری ساڵی ( ٣٠٣) ی کۆچی دا بەشەهیدی سەری نایەوە ..خواڵێ خۆش بێت و پلەو پایەی بەرزبکاتەوە لە بەهەشتی بەرین دا لە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وهاوەڵە بەڕێزەکانی دا ..



# پێشەوا ئەبو داود

ناوی :﴿ سلێمانی کوڕی ئەشعەسی کوڕی عەمرە ﴾ ناسراوە بە ﴿ ئە بوداود ﴾ سالی (٢٠٢) ی کۆچی لەدایك بووە لە ولاتی ﴿ سەجستان ﴾ ...

ئەبوداود هەر لە منالی یەوە بلیمەتی و زیرەکی بێ ئەندازەی پێوەدیاربوە ، کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە پشتیوانێکی باش بووە بۆ هاندانی ئەبوداود و سەرکەوتنی لەبواری زانیاری دا . چونکە ئەو سەردەمە ، سەردەمی زانست و زانیاری و گرنگی‌دان بووە بە زانایان لە جیهانی ئیسلامی دا .. هەر لە مندالیەوە سەر قالی فێربوونی ( فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ) (ﷺ) بووە و لە وولاتی سەجستان و چوار دەوری دا فەرمودەی زۆری بیستوە .. لەتەمەنی هەژدەسالی‌یەوە کەوتۆتە گەشت و گەڕان بە دوای فێربوونی زانیاری فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا دا (ﷺ) . پتر لە ( ٥٠٠ ) هەزار فەرمودەی لەبەرکردوە وبووەتە ماددەیەکی باش بۆ ئەو کتێبانەی کەنوسیویەتی و موسوڵمانان سوودی لێوەردەگرن .

## گەشتەکانی

ئەبوداود چەندین وولات گەڕاوە بەدوای زانیاری دا .. لە هەژدەسالیدا واتە لەسالی (٢٢٠)ی کۆچی‌دا ( سەجستان ) ی بەجێهێلاوە و هاتۆتە عێراق وشام ومیصر و حیجاز و خۆراسان ، هەتا لە شاری ( بەصرە ) دا جێگیربووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردوە ..

# زانستی ئەبوداود

ئەوەی بەووردی سەرنج بدات لە نوسراوو زانستەکانی ﴿ ئەبوداود﴾ ، بۆی دەردەکەوێت کە تاچ رادەیەك بلیمەت و پسپۆرو سەرکەوتووبوە ، خاوەنی بینایی‌یەکی بە هێزو تێروانینێکی وورد بووە لە بواری ﴿ سوننەو قورئان ﴾ دا .. بەتایبەتی لە بواری فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دا شارەزابووە .. هەردوو ئیمام ﴿ موحەممەدی کوڕیئیسحاقی صاغانی و ئیبراهیمی حەربی ﴾ دەڵێن : ﴿ زانستی حەدیث نەرم بووە لەبەر دەستی ئەبوداود دا ، هەرچۆن ئاسن نەرم بووە لەبەر دەستی داود پێغەمبەردا (ﷺ) ﴾ هەروەها ئەبوداود لە زانستی ( جەرح وتەعدیل ) دا شارەزابووە .. سەرناسێکی بلیمەت بووە ناوو نەسەب ومردوو زیندووەکانی بەئاسانی دەناسی .. بە تایبەتی کە ئەبوداود شاگردو قوتابیەکی زیرەکی ﴿ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و یەحیای کوڕی مەعین و ئیبن مەدینی﴾ بووە.

## زانستیعیللەتی حەدیث

ئەم زانستە قورس و پڕ لەکێشەیە .. ئەبوداود بە توانا بوە تیایدا .. بە ئاسانی قوفڵەکانی شکاندوە و پەی بە نهێنی و ووردە کاریەکانی بردوەو لە کتێبە ناودارەکەی﴿ السنن ﴾ دا چەندین باسی گرنگی کردوە ..

# زانستی فیقه

هەروەك ئەبوداود لە زانستی حەدیس دا شارەزابووە ، بەهەمان شێوە لە زانستی فیقهوشەرع دا بلیمەت بووە .. ماوەیەکی زۆر قوتابێتی و هاوەڵێتی ( ئیمام ئەحمەدی ) کردوە لەبارەی ووردەکاریەکانی شەرعەوەپرسیاری لێکردوە ..

## مامۆستاکانی

لەخزمەت دەیان زانای ناودارو لە چەندین وولآتدا زانستی وەرگرتووە ، لەوانە﴿ سولەیمانی کوڕی حەرب ، ئیسحاقی کوڕی راهەوەی ، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و عەلی مەدینی ،یەحیایکوڕی مەعین و یەحیای کوڕی شوەریح ، قوتەیبەی کوڕی سەعید و چەندەهای تر .﴾

## قوتابیەکانی

چەندین زانای بلیمەت ، قوتابێتی و بەردەستی ئەبوداودیان کردوە و لەکانیاوی ئەم زانایە زانستیان هەڵگۆزیوە .. ، لەوانەش : ﴿ پێشەوا نەسائی ، ئەبو بەکری کوڕی ئەبی دنیا ، محمدی کوڕی یەحیای سەولی ، ئەبو حامدی ئەصبەهانی ، ئیسحاقی وەراق ، ئەحمەدی کوڕی یاسینی هەرەوی ، .. عبدالله ی کوڕی یەعقوب.. هتد ﴾

زانای ناودار ( ئیسحاقی کوڕی هارون ) ئەڵێ : ﴿ ئەبوداود لە دونیادا خوا بۆ حەدیث دروستی کردوە لەقیامەتیش دا بۆبەهەشت دروستی کردوە ﴾.

ئەبوعبدالله ی کوڕی مەندە ئەڵێ : ﴿ ئەوانەی تەخریجی حەدیثیان کردوە و بژاریان کردوون چوارن : بوخاری و موسلیم و ئەبوداود و نەسائی ﴾ ..

سەهلی کوڕی عبداللەی تەستەری هاتەخزمەت ئەبوداود ، وتی : ﴿ داوایەکم هەیە ، ئەبوداودیش فەرمووی بڵێ : وتی نایڵێم هەتاوەعدم نەدەیتێ بۆم جێبەجێبکەیت .. وتی : باشە بڵێ ، وتی : ئەو زمانەت دەر بێنە کە فەرمودەی پێغەمبەری خوات پێڕیوایەت کردوە ، با ماچی بکەم ، ئەبوداود زمانی دەرهێنا و سەهلی کوڕی عبدالله زمانی ماچ کرد﴾ ..!!

﴿ ئەبو ئەحمەد موەفەق ﴾ کە وەلی عەهدی خەلیفەبووە لە بەغدا، پاش کاتێکی درەنگ و دوای نوێژی مەغریب ئەچێتە مزگەوت بۆ خزمەتی ئیمام ئەبوداود ، ئەبوداود ئەفەرموێ : ﴿ ئەوە چۆن جەنابی ئەمیر بەم درەنگ وەختە هاتووە بۆمزگەوت ؟!وتی : داوا لەجەنابتان ئەکەم بچن بۆ بەصرە بۆ ئەوەی لەوێ جێگیربیت و لەهەمو لایەکەوە قوتابیانی زانست بێنە خزمەتت بۆ وەرگرتنی عیلم ، چونکە تۆ ئەتوانی بصرە ئاوەدان بکەیتەوە ، چونکە ئێستا چۆڵ وێرانە وئاوەدانی تیانی‌یە ﴾ !! هەروەها داوا کارم مەجلیسی عیلم دابنیێی هەتا خەڵك لەزانیاریت بەهرەمەند بىن .. پاشان مەجلیسی تایبەتی بۆ منالەکانم دابنیێی چونکە کوڕەکانی من کوڕی ئەمیرن تێکەڵی خەڵکی عامەو ڕەشۆکی‌نابن .. ئیمام ئەبوداود وتی : دوانی یەکەمیانم قبوڵە .. بەلاّم زانیاری موڵکی هەموو کەسێکە ، هەژار و دەوڵەمەند . کەسدار و بێ‌کەس فەرقیان نی‌یە .. ئەبێ‌کوڕەکانی تۆش بێن لەگەڵ خەڵکی‌دا گوێ بگرن و فێربن ..

بەم شێوەیە منالەکانی ئەمیر ئەهاتن لەگەڵ خەڵکی‌دا لە مەجلیسەکانی ئەبوداودا فێری زانیاری دەبوون و مەجلیسەکانی ئەبوداود شاری بەصرەی ئاوەدان کردەوە .

## کتێبەکانی ئەبوداود

١-﴿ السنن ﴾ لەهەموو ولاّتانی ئیسلام دا چاپ کراوە .

٢-﴿ المراسيل ﴾ زیاد لە جارێك چاپ کراوە.

٣-﴿ المسائل ﴾ ( پرسیارەکانی ئەبوداودە لەئیمام ئەحمەد ) .

٤-﴿ كتاب الزهد﴾ دەست نووسە .. وەچەندەها کتێبی تر .

ئەمەو ئەبوداود چەندین نوسراوی تری هەیە کە ( ون بوون) و سەروشوێنیان نییە ,,,,,

١- ﴿الناسخ والمنسوخ ﴾

٢- ﴿ كتاب القدر ﴾

٣-﴿ فضائل الأنصار ﴾

٤- ﴿ دلائل النبوة ﴾ وچەند سەرچاوەو کتێبێکی تر..

## لەبارەی ﴿ ئەبوداود ﴾ ەوە وتویانە

١-﴿ عبدالرحمن ی کوڕی ئەبوحاتەم ﴾ : ئەبوداود ( سیقەیە ) .

٢-﴿ ئەحمەدی کوڕی محمەدی کوڕی یاسین ﴾ : ئەبوداود لە سوارچاکانی حەدیثە .

٣-﴿ ئیبن حیببان ﴾ : ئەبوداود یەکێکە لەپێشەواکانی ناوداری دونیا لە فیقه وعیلم و وەرع سوننەت دا .

٤-﴿ حاکمی نیسابوری ﴾ : داود پێشەوای ئەهلی حەدیثە بێڕکابەرو مونافیس .



## سونەنی ئیمام ئەبوداود

ئاشکرایە کەئەبوداود بەرێزترین قوتابی و شاگردی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوە ، بەهەمان شێوە لە حەدیس و زانستەکانی سودی دیوە . بۆیە ئیمام ئەبوداود فەرمودە ناسێکی بەتواناو شەرع زانێکی لێهاتوو بوە .. ئەبوداود ڕچەشکێنی کردوە لە نوسینەوەی ئەم کتێبەدا . چونکە زانایانی پێش ئەبوداود کە ئەوانیش کتێبی تایبەتی فەرمودەیان ئەنوسی لەگەڵیدا مەوعیزەو ئاداب و داستان و دەنگ و باس و چەندین بابەتی‌تریان یاداشت کردبوو . تەنها ئیمام ئەبوداود بوو کەلەکتێبەکەی دا سونەنە صەحیحەکانی نوسیوە بەتەنهاو بەبێ ئەوەی هیچ بابەتێکی تری لەگەڵدا بنوسێ .

ئەبوبەکری کوڕی داسە کەقوتابی ئیمام ئەبوداود بوە ئەگێڕێتەوە لە ئەبوداودی مامۆستایەوە کەوتویەتی : ﴿ ٥٠٠ ﴾ هەزار فەرمودەی پێغەمبەری خوام نوسیوەتەوە (ﷺ) بەڵام ﴿٤٨٠٠﴾ فەرمودەم لێ گوڵ بژێر کردوە و لەم کتێبەدا نوسیومەتەوە .﴿ خەتابی ﴾ ئەڵێ : کتێبەکەی ئەبوداود بەرەنجامی کۆکردنەوەو پوختە کردنەوەی کتێبە گەورەکانی فەرمودەو فیقهن ، پێش ئەوو دوای ئەویش کەسمان نەدیوە وەك ئەبوداود لەم خزمەتەگەورانەی کردبێت . ئیمام ئەبوداود سودمەندبوە لە چەندین نوسراوی پێش خۆی لە گرنگترینیان ﴿ الموطـأ ﴾ ی ئیمام مالیك ، جامعی سوفیان ، نوسراوەکانی وەکیع ، کتێبەکانی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و حەسەن ئەلحەلوانی وەچەندینی تر ..﴾

جیّ‌ی سەرنجە ئەبوداود ئـەم كتێبـەی بەشـێوازێكی ئاسـان و ڕەوان نوسیوە ، بەمەبەستی سود گەیاندن بەخـەڵكی ، ئەمـەش بەڵگـەی نیـەت پـاكی و دڵسـۆزی بـوە بـۆ خـوای پـەروەردگار.. كـاتێك ئـەبوداود لـە نوسینەوەی كتێبە بەناوبانگەكەی ﴿ السنن ﴾ بووەوە خستیە بەردەستی ئیمام ئەحمەدی كوڕی حەنبەل ئەویش دەستخۆشی لێكردو بەلایـەوە باش بوو .

ئەبوداود ئەفەرموێت : ﴿ نیو ملێون فەرمودەی پێغەمبەری‌خوام لەبەر كردوە ، لەم كتێبەدا واتـە (السـنن ) چـوار هـەزارو هـەش سـەد حەدیسـم نوسـیوە كە لەو نیوملیـۆن حەدیسە گوڵبژێـرم كـردوە ، ئەوەی صـەحیح و نزیـك نـەبوبێ لـە ( صـەحیح )ە وە نەمنوسـیوە .. هـەروەها ئـەبوداود ئەفەرموێ : ئەم چوار فەرمودەیە بەسە بۆ دینی‌مرۆڤی‌خواناس :

١- ﴿ الاعمال بالنيات ﴾ ..

٢- ﴿ من حسن اسلام المرءتركه مالا يعنيه ﴾..

٣- ﴿ لايكون المؤمن مؤمنا ، حتى يرضى لاخيه ما يرضى لنفسه ﴾..

٤- ﴿ الحلال بين .. والحرام بين ﴾ ..

## كۆچی دوایی

زانای خواناس و شۆڕە سواری مەیدانی حەدیسەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئەبوداودی سەجستانی لە ساڵی (٢٧٥) ی كۆچی لەتەمـەنی ﴿ ٧٣﴾ ساڵی دا گیانی پاكی بەرەو بەهەشتی بەرین فڕی و دای لە شەقەی باڵ .. لەشـاری بـەصرە گیـانی پـاكی سـپارد خـوا لێ‌ی ڕازی بێـت و بیخاتە بەر ڕەحمەتی خۆیەوە .

## زانای ناوداری حەدیث

## ﴿ ئیبن ماجە ﴾

ناوی﴿ محمدی کوڕی یەزیدە ﴾ ، ناسراوە بە( ئیبن ماجە ).. ماجە لە قەب وشوهرەتی(یەزیدی )باوکی بووە .. خۆیشی بە(ئیبن ماجە ) ناسراوە . لەبەرئەوەی خەڵکی شاری قەزوینە لەولاتی فارس ، پێی ئەوتریٚ﴿ قەزوینی ﴾.. ساڵی (٢٠٩) ی کۆچی لەشاری قەزوین و لە ماڵێکی خانەدان و نەجیب و ناسراودا کەخاوەنی پلەو پایەیەکی زۆر بوون هاتۆتە دونیاوە .

ئیبن ماجە بەرەویەی پیاوچاك و خواناساندا ڕۆیوە ..خاوەنی عەقیدەیەکی پاك و ئیمانێکی بەرزو خورەوشتێکی جوان و خاوێن بوە .. نوسراوو زانستەکانی بونەتە خێروبێر وموسوڵمانان سودیان لێوەرگرتوە ، لە ووردبونەوە لە﴿ سونەنەکانی ﴾ ئیبن ماجە بۆمان دەردە کەویٚ کەچ هەڵکەوتوو پارێزکار و خواناسێك بووە ، خاوەنی کتێبی ﴿ السنن ﴾ ە کە ( ١٥٠٠) بابە ..چوار هەزار فەرمودەی پێغەمبەری خوای تیایە (ﷺ) ..

## قوتابیەکانی ئیبن ماجە

لەو کەسانەی کەفەرمودەیان لە ئیبن ماجەوە ریوایەت کردوە ئەمانەن :

١- ﴿ محمدبن عیسى الأبهي﴾

٢- ﴿ ابو الطيب البغدادى ﴾

٣- ﴿ على بن ابراهيم القطان ﴾

٤- ﴿ احمد المدينى ﴾ .. وەچەندەهای تر ..

## گەشتەکانی ئیبن ماجە

هەروەکـو سـوننەتی فـێرخواز و قوتابیـانی زانسـت لـە هـەموو سەردەمێکدا ، ئیبن ماجە ولأتی خۆی بەجێ هێلأوە و ولأتان گەڕاوە بۆ گوێ گرتن وفێربوون ، هەتا توانی زانستێکی زۆر کۆبکاتەوە و پاشان لە ولأتی خۆی کە ( قەزوینە ) نیشتەجێ بوو ، وازی لە گەشت وگەڕان هێنا ..

لەو ولأتانەی کە ئیبن ماجە گەڕاوە و سەردانی کردون :

١- خۆراسان . ٢-عێراق . ٣-حیجاز . ٤- شام . ٥- مصر .

وە چەندەهای شاری ئەم ولأتانە .

## فێربوونی زانیاری

ئیبن ماجە دەستیکرد بەخوێندنی زانست وسەرەتای قوتابێتی لە ولأتی خۆیدا لە(قەزوین)دەست پێکرد .. لەسەر دەستی زانای بەڕێز ﴿ علی کوڕی محمدی تەنافسی ﴾ خوێندنی دەست پێکردوە .. بەردەوام بووە لە خوێندن لە خزمەتیا ، ( تەنافسی ) ی مامۆستای ئیبن ماجە کۆچی دوایی ئەکات لەساڵی (١٣٣) ی کۆچی دا لە دونیا دەرئەچێ .

بەڵام ئیبن ماجە بەو بڕەزانیاریە قایل نابێ کە لە ولأتی قەزوین دا فێری بوە بۆیە ئەکەوێتە گەشت و گەڕان بەولأتانی تردا بۆ زیاد کردنی عیلم و فیقھ و حەدیثیپێغەمبەری خوا(ﷺ) هەتا گەیشتە ئاستێك بووە یە کێك لەزانا ناسراوەکانی ئوممەتی ئیسلام ..

## مامۆستاکانی

لەم زانا بەڕێزانەوە زانیاری وەرگرتوە :

١- ﴿ عەلی کوڕی محمدی تەنافسی ﴾

٢- ﴿ ئەبو حوزافەی سەهمی ﴾

٣- ﴿ مصعبی کوڕی عبداللە﴾

٤- ﴿ عبداللەی کوڕی جەمحی ﴾

٥- ﴿ عبدالسلام کوڕی عاصم ﴾ و چەندەهای تر ..

## زانستەکانی ئیبن ماجە

ئیبن ماجە زۆر زانابوە ، بەڵام لە بواری حەدیس دا زۆر سەرکەوتوو پسپۆڕ بوە .. بۆیە زیاتر وەکو (فەرمودەزانێك) ناسراوە ،لە زانستی حەدیث دا شۆڕەسوارانە ئەسپی خۆی تاوداوە .. لەگەڵ ئەمەشدا لە چەند بوارێکی‌تردا توانایەکی باشی هەبوە ، لەوانە :

١-عیلمی فیقه ، خاوەنی توانایەکی باش بوە تیایدا .

٢-زانستی تەفسیر ، پێشەوا ( زەهەبی ) بە ( موفەسیر ) و ڕاڤەکاری قورئان ناوی بردوە .

٣-زانستی مێژوو ، کتێبێکی گرنگی لە مێژوودا نوسیوە لە سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە تاسەردەمی خۆی .



## سونەنی ئیبن ماجە

ئەوماوەیەی کەئیبن ماجە تیا ئەژیا ، سەر دەمی نوسینەوەو کۆکردنەوەی سونەن بوو ، بەڵام وڵاتی قەزوین کە زێدی ئیبن ماجەیە و تیایدا چاوی بەژیان هەڵ هێناوە لە بواری نوسینەوەی فەرمودەدا سست ولاوازبوون .. بەڵام خوای کاربەجێ ئیبن ماجەی تیا هەڵخستن هەتا لە ناویاندا سوننە کۆبکاتەوە و پاشان بڵاویشی بکاتەوە ، بۆیە ئیبن ماجە چەندین پەڕاوی نوسی لە گرنگترینیان ﴿ سونەنە﴾ کە لەهەمووکتێبەکان بە کەڵکترە بە درێژایی کات خەڵکی سودی لێوەرئەگرن ..

لەسەرەتادا باسی سوننە و گرنگی پەیڕەوی کردن و شوێن کەوتەیی سوننەی کردوە .. بنەماکانی سوننەی نوسیوە ، پاشان کردویەتی بە چەند بەشێکەوە ..کاتێك سەیری سونەنی ئیبن ماجە ئەکەین بۆمان دەرئەکەوێ کەهەڵبژێراوی زانستێکی زۆر فراوانە .. هەرچەندە مێژووی نوسینەوەی ئەم کتێبە و چۆنیەتی دەست پێکردنی نەزانراوە ، بەڵام وادیارە بەمەبەستی ئەوەی ببێتە سەرچاوەیەکی باش و پێشەوای موسوڵمانان ئەم کتێبەی نوسیوە ..ئیبن ماجە ئەم کتێبەی ناونا ( سونەن ) ، ئەبوحەسەن قەتان ئەڵێ : ﴿ کتێبی سونەنی دانراوی ئیبن ماجە بریتی یە لە ( ٣٢) کیتاب و هەزارو پێنج سەد باب و چوار هەزار فەرمودە ..

### کۆچی دوایی

ساڵی (٢٧٣) ی کۆچی و لە تەمەنی (٦٤) ساڵیدا لەدونیا دەرچوو بۆ بەهەشتی بەرین ..

# زانای خواناس

# تـــــیرمـزی

ناوی :﴿ محمـدی کـوڕی عیسـی‌ی کـوڕی موسـی ﴾ یـە ، کونیـەی ﴿ ئەبو عبدالله ﴾یە و ناسراوە بە ( تیرمزی ) ، پێشەوا محمدی تیرمزی لە ساڵی( ٢٠٩) یان ( ٢١٠) ی کۆچی لە ناوچەی تیرمز کەئەکەوێتە باکوری ڕووباری ( جەیحون )ەوە لە دایك بوە ..پاش ئەوەی کەوتە گەشت و گەڕان بە دوای فێربوونی زانیاری دا ، بینـایی چاوەکـانی لـە دەسـت ئـەدات و کوێرئەبێ .. تیرمزی چەندین وولآت ئەگەڕێ هەروەکو عادەتی قوتابیانی عیلم بۆ فێربوونی زانیاری ، لەوشارو ولآتانەی سەردانی کردون :

١-خۆراسان . ٢- بەصرە . ٣- واسط . ٤-بغداد. ٥-مەککە. ٦-مەدینە

## نوسراوەکانی پێشەوا تیرمزی

چەندیـن بەرهـەمی گرنگـی لـە دوای خـۆی بـە جێهێـلآوە .. کـە بـەرەنجامی‌هیلاکی و زەحمـەت و شـەونخونی و گەشـتی چـەندین سـاڵەو گوێگرتن بووە لە مامۆستاکانی ، تا ئێسـتاش لـە سەرتاسـەری جیـهاندا موسوڵمانان بە گشتی سوودی لێ وەردەگرن ..

لەو نوسراوە بە پێزانەش :

١-﴿ الجامع ﴾ : کەناسراوە بە ( السنن ) بە ناوبانگترین دانراوی تیرمزی یە و یەکێکـە لـەو شـەش کتێبـە گرنگـەی کەبنـەمای زانسـت و سـەرچاوەی فەرمودەکانی پێغەمبەری خوایە .

٢-﴿ العلل ﴾ کتێبێکی زۆر بە کەڵك و چاپ کراوە .

٣-﴿ الشمائل ﴾ : سیفاتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باس دەکات .
٤-﴿ اسماء الصحابة ﴾ : ناوی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)) ی تیا یاداشت کراوە ،وەچەندەها کتێبی تر .

زانایانی هاوچەرخ و هاوسەردەمی ئیمام تیرمزی زۆر مەدحی ئەم زانا لە خواترس و پابەندەیان کردوە کە وەکو مەدالیای فەخری وان لەسەرسنگی ئەم زانایە کەسینەی پڕبوە لە تەقواو زانست و عیلم ، لەوانە :
-﴿ عومەری کوڕی حافظ ﴾ ئە ڵێ : بوخاری لە خۆراسان کەسی بەجێ نەهێلاَ دوای خۆی باشتر لە ( ئەبو عیسای تیرمزی ) لە زانست وحیفظ و وەرع و دنیانەویستی دا .
-﴿ ئیبن حیبان ﴾ ئەڵێ : ئەبوعیسا یەکێکە لەو کەسە دەگمەنانەی کە فەرمودەکانی کۆکردۆتەوە و پۆلێنی کردوون .
-﴿ ئەبوسەعدی ئیدریسی ﴾ ئەڵێ : تیرمزی یەکێکە لەپێشەوایانی زانستی حەدیث .

## خواناسی ئیمام تیرمزی

جگە لەوەی خاوەنی زانستێکی فراوان بووە ، پیاوێکی ئیستقامەدارو خواناس و لەخواترس بووە ، هێندە لەخوا ترساوە ، گریاوە بە ڕادەیەکی زۆر . تەنانەت بەهۆی گریانی زۆری لە ترسی خوا چاوەکانی کوێربوون .. بەلاَم ڕۆشنایی خستە دڵ و دەروونی موسوڵمانانەوە لەجیهاندا بەهۆی نوسراوە بە کەڵکەکانییەوە ..

## مامۆستاكانی

لەو گەشتە چەندین ساڵەو چەندین وولاّتەی پێشەوا تیرمزی دا ، بەخزمەتی كۆمەڵێكیناودار لـە زانایـان و بلیمـەتانی زانسـتی حـەدیس و فیقـهی ئیسـلامی گەیشـتووە و لـە زانسـتەكانیان بـەهرە مـەندبووە و قوتابیەكی چالاك و زیرەك بووە و وەجاخی ڕۆشن كردونەتەوە ، لەوانەش : ﴿ قوتەیبـەی كـوڕی سـەعید ، ئیسـحاقی كـوڕی راهـەوەی ، محمدی كوڕی رافع ، ئیبن یەحیای عەدەنی وچەندەهای تر ﴾ ...

## قوتابیەكانی

تیرمزی (خـوالّیڕازی بێـت ) وەكـو چـرا ڕۆشـنایی هـەبووە بـۆ چوار دەورەكەی و قوتابیـانی بەوێنـەی پەروانـە دەوری ڕۆشـنایی زانسـتی ئەم زانایە بوون، هەمیشە عەودالّی بەهرەمەندی بوون لەو زانستە زۆرانـەی كە خوابەخشیویەتی بەم زانا دڵسۆز و خواناسە ، بۆیە قوتابیـەكانی زۆرن كە دوای خۆی درێژە پێدەری كاروانی دینـداری و خواناسـی و گەیاندنی پەیامی حـەدیث و فیقه بوون ، لەوانـەش : ﴿ ئەبوبـەكری سـەمەرقەندی ، ئەبوحامیدیمروزی ، ئەحمەدی نەسفی ، مەكی كوڕی نوح و محمدی كوڕی محمدی هەرەوی ، رەبیعی باهلی و چەندەهای تر ﴾ ...

## زانستەكانی ئیمام تیرمزی

لە چەند بوارێكی زانستی جۆراو جۆردا سەركەوتوو بەتوانا بووە ، لەوانە :

١-زانسـتی حـەدیس : كتێبـی ( الجـامع ) گـەورەترین بەڵگەیـە لەسـەر بەتوانایی ئیمام تیرمزی لەم بوارە گرنگەدا و شاهیدی توانا و بیر تیـژی تیرمزیيە لەزانستی فەرمودەدا ..

١-زانستی عیللەتی حەدیث : زۆر کەمن ئەوانەی بتوانن لەدەریای قوڵی ئەم زانستە بپەڕنەوە .. یەکێك لەوانە تیرمزی بووە کە لە بارەی ئەم زانستەوە نوســـــیویەتی و زانـــــابووە تیـــــایدا زۆر پشـــــتی بەســـــتوە بە ( بوخاری ) مامۆستای.

٢-زانستی سەرناسی وجەرح وتەعدیل : زانستی جەرح وتـەعدیل دەرگـا والآدەکات لە ڕووی زانستی عیللەتی حەدیس دا ، چونکـە سـەر ناسـی و هـەواڵ زانینـی ( ڕاوی )یـەکان و دەنـگ وبـاس وهـەواڵیان زۆر پێویسـتە بـۆ دیاری کردنی ڕاست و دروسـتی فەرمودەیـەك یـان بەپێچەوانـەوە .. بۆیـە تیرمزی لـەم زانستـەش دا سـەرکەوتوو بـووە وەك زانایـەکی شـارەزا قسـەی تیاکردوە ..

٤- زانستی فیقە : تیرمزی دارای زانیاریەکی باش بووە بە مەزهـەبی شـەرع ناسەکان وفیقهی ﴿ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی .. شـافیعی و مـالیك و سـەوری وئەحمـەدی کوڕی حەنبـەل و ئیسحاقی ڕاهـەوەی و ئـەوانی تـری)تـاوتوێی کـردووە باســی کــردوون و بــە شــێوازێکی ئاســان و ڕەوان لــە کتێبــە بەناوبانگەکەی ( الجــامع ) دا یاداشـتی کـردون و ڕای خـۆی سـەرکەوتوانە لەپاڵیدا نوسیوە .

## سونەنی تیرمزی

تیرمزی زانا، (خوای لێ ڕازی بێت ) یەکێك بووە لەقوتابیە نەجیب و زیرەکەکانی پێشەوا ( بوخاری ) .. پاش ئەوەی گەیشتە ئاستێکی بەرزی زانیاری ، ویستی بەهەمان ڕەویـەی بوخاری مامۆستایدا هـەنگاوبنێ .. دەستی کرد بە کۆکردنـەوەو نوسـینەوەی کتێبە گرنگەکەی کە لەسـەرەتادا هـەر بەنوسـینەوەی دەقی فـەرمودەکان دەستی پێکرد پاشان ڕای مەزهەبەکان و عیللەتی حەدیثی تیانووسی ..

وەکو تیرمزی خۆی ئەفەرموێت : ﴿ ئەوەی وای لێکردین قسەی فەقیە و زاناکان لەگەڵ عیللەتی فەرمودەکانی تیا یاداشت بکەین پرسیاری خەڵکی بوو ..ماوەیەك لێی وەستاین و تەنها هەر فەرمودەمان دەنوسی ، پاشان بە ئومێدی سوود گەیاندن بە خەڵکی ئەم بەشەمان بۆ زیاد کرد ﴾... سونەنی تیرمزی لە چەند کتێبێکی گرنگەوە سەرچاوەی گرتووە ، لەوانە ﴿ الموطأ ﴾ ی ئیمام مالیك ،نوسراوەکانی وەکیع ، سوفیان و عبدالرزاق ئیبن موبارك و شافیعی و تەواریخی بوخاری و هتد ..﴾ شایانی باسە پێشەوا تیرمزی ئەم کتێبەی ناونا ( الجامع ) ، بەڵام زۆر لەزاناکان ناویان لێنا﴿ سونەن ﴾ .

## کۆچی دوایی

پاش تەمەنێکی پڕ لە بەرە کەتی ( ٧٠) ساڵی، پاش ئەوەی زۆربەی ژیانی بە نابینایی بردە سەر .. بەرهەمی زۆری بە جێ هێلا .. لە تەنگەبەری ئەم دونیا فانییەوە شەوی دووشەممە ١٣/رجب /٢٧٩ ی کۆچی لە گوندی ( بوغ ) سەربەناوچەی ( تیرمز ) گیانی پاکی سپارد ..



## زانای خواناس

# ئیمام دارمی

ناوی:﴿ عبداللەی كوڕی عبدالرحمن ی كوڕی فەزڵی كوڕی بارامی كوڕی عبدالصمدە ﴾ بە (ئەبومحمد ) ناودەبراو ناسراوە بەدارمی ، نیسبەت بە دارمی كوڕی مالیك ی بەنیتەمیم .. ساڵی (١٨١) ی كۆچی هاتۆتە دونیاوە .. لە ناوچەی سەمەرقەند لە دایك بووە .. خۆی ئە فەرموێ : ئەو ساڵەی عبد اللەی كوڕی موبارەك لە دنیا دەرچوو من هاتوومەتە دنیاوە .. بەلاّم ووردەكاریەكانی ژیانی ئیمام دارمی بە پێی پێویست تۆمار نەكراوە لە سەرچاوەكاندا .. یە كێك لە سیفاتە بەرزەكانی ئەم زانا خواناسە ، تەوازوع و خۆبەكەم زانین بووە ،بەلایەوە ئاسایی بووە زانست لە گەورە و بچوكەوە وەربگرێ.. لە وەرگرتن و لە بەر كردنی زانیاری دا زۆر بلیمەت و زیرەك بووە .. لە كەسانی ئەمین و باوەڕ پێكراونەبوبێ فەرمودەی وەرنەگرتوە .. بەلاّم سەرەتای قوتابێتی ودەست كردنی بە وەرگرتنی زانیاری دیاری كراو نی‌یە...

## مەناقبی پێشەوا دارمی

ئیمام عبد اللە دارمی یەكێك بووە لەوكەسایەتیە خواناس و ئەهلی وەرعانەی كەم وێنەو دەگمەن بوون لە دونیا ..خاوەنی زانستێكی فراوان و بیرێكی قوڵ و كردەوەیەكی زۆر بووە .. هەموو سیفاتە بەرزەچاكەكانی زانست و ڕاست گۆیی و وەرع ودونیانەویستی و خۆهیلاك كردنی لەخواپەرستی‌دا تیابووە ..

دارمی بەنمونە باس دەکرا لەبوارەکانی دینداری و خۆگریو داوێن پاکی و دەوام داری لەسەر خواپەرستی،ئەرکی قەزاوەتی ڕەدکردەوە .. پاشان سوڵتان زۆری لێ کرد ئینجا قبوڵی کرد ... تەنها یەك قەزیەی بینی .. ئیدی ئیستقالەی نووسی و وازی هێنا .... ئیمام عبدالله دارمی بووە مایەی خێروبەرەکەت بۆ ئەهلی سەمەرقەند .. لەو وڵاتەدا زانستی فەرمودەی بڵاوئەکردەوە .. دا کۆکی ئەکرد لە فەرمودە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)زۆر ژیرانە بژاری فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ی ئە کرد و هەڵبەسراوەکانی جیائەکردەوە .. بانگەوازی ئەکرد بۆبڵاو کردنەوەی سوننەودیفاعی لێ ئەکرد و ئەچوو بەگژ ئەوانەی بیدعەچێتی ئەکەن ...بۆیە ناوو شۆرەت و ڕێزی لە دڵ ودەروونی موسوڵمانانندا زیادی کردو خۆشەویستی برەوی سەند ..بەسەشایەتی دانی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەبارەی ئیمام عبدالله ی دارمییەوە کە ئە فەرموێ ﴿ ئەو سەییدو گەورەیە .. من کوفریان خستە بەردەستم ڕەدم کردەوە .. بەڵام دارمی دونیایان خستە بەردەستی وەری نەگرت و ڕەدی کردەوە ﴾ ..

## گەشتەکانی

ئیمام دارمی ، تاقانەی ناوچەی سەمەر قەندبووە ، لە زانستی حەدیس دا .. بەڵام بە پێویستی زانیوە بۆ دەوڵەمەندکردنی گەنجینەی زانیاری خۆی بچێت بۆ شاری بغداد، مەڵبەندی زانست و عیرفانی ئەو سەردەمە .. لە شارەکانی بغداد و کوفە و واست و بصرەدا زانستی وەرگرتوە ..

لە شامیش قوتابێتیکردوە لە شارە کانی دیمەشق و حمص و صور و لەحیجازیش لە شارە کانی مەککە و مەدینە گویٚ ی گرتووە لە مامۆستاو پێشەوایانی ئەهلی حەدیث . پاشان گەڕاوەتەوە بۆ سەمەرقەند و بووەتە پێشەوای ئەهلی سەمەرقەندو خێرو بەرەکەتی زانستی لە و ناوچەیەدا بڵاو کردەوە و تائێستاش موسوڵمانان لە زانستی ئەم زانا خواناسە بۆ خواسوڵحاوە بەهرە مەندبوون ، بە تایبەتی کە کتێبی ﴿ سنن الدارمی ﴾دانا، کە بە ناوبانگترین نوسراو بەرهەمی ئەم زانایەیە .. ئەم کتێبە بە سوود ترین کتێب و نوسراوی دارمی‌یە لە زانستی فەرموودەدا.

## مامۆستاکانی دارمی

لە گەشتە درێژخایەنەکەی دا ، شاگردی و قوتابیەتی چەند زانایەکی کردوە ، وە لە خزمەتیاندا بەهرەمەند بووە لەعیلمی زۆر و پڕ لە بەرەکەتیان .. لەو زانایانە : ﴿ یەزیدی کوڕی هارون ، ئەبوعەلی عبیداللە ی حەنەفی ، ئەبو موغیرەی خەولانی ، بیشری کوڕی عەمری زەهرانی ، محمدی کوڕی یوسفی فریابی ، .. هتد ﴾ هەروەکو لە هاوەڵانی خۆی ریوایەتی فەرموودەی کردوە ، وەکو : ﴿ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ، یەحیای کوڕی مەعین ، عەلی ئیبن مەدینی ﴾ ...

## قوتابیەکانی ئیمام دارمی

ئەم زانا ناسراوانە فەرموودەیان لە دارەمیەوە ، ریوایەت کردوە ﴿ ئیمام موسلیم ، ئیمام ئەبوداود ، ئیمام تیرمزی ، محمدی کوڕی بەشاری بەندار، ئەبو زەرعە ، صاڵحی کوڕی محمدی جەزرە ، جەعفەری فریابی ، محمدی جارودی ، عیسی ی کوڕی عومەری سەمەرقەندی ﴾ .

## زانستەكانی

خوای بالاّدەست دەرگای خێرو زانستی خستە سەرپشت بۆ ئەم زانا بۆخوا سوڵحاوە ... لە هەموو بوارە كانی زانست دا هێندە شارەزایی هەبووە كە شایستەی پێشەوایەتی خەڵك بووە ..لەزانستی فەرمودەدا خاوەنیتوانایەكی زۆر بووە ، دیقەت گرتن لە كتێبی ﴿ مەسنەدی ئیمام دارمی ﴾ دەری ئەخات كە چەند پسپۆڕانە نووسیویەتی .. لە دەریای فراوانی فیقهدا دا مەلەوانێكی شارەزابوە .. لە ڕاڤەكردنی قورئاندا موفەسیرێكی خامەڕەنگین بووە .. ئەم زانستانەی سەخییانە گەیاندۆتە خەڵك و مەردم سوودیان لێوەرگرتووە..

زانایان لەبارەی دارمییەوە ، وتویانە :

-﴿ ئیمام ئەحمەدی كوڕی حەنبەل ﴾ فەرموویەتی : دارمی ، ئیمامە .. پێشەوایە .

-﴿ حافزبەنداری كوڕی بەشار ﴾ مامۆستای دارمی، شانازی ئەكرد كە مامۆستای دارمییە .. هەروەكو مامۆستای ئیمام بوخاری و ئیمام موسلیم و ئەبوزەرعە بووە..

-﴿ دارەقوتنی ﴾ ئەڵێ : دارمی سیقەیە .. بەناوبانگە ..

-﴿ ئەبو سەعیدی ئەشەج ﴾ ، ئەفەرموێ : عبداللەی كوڕی عبدالرحمن ی دارمی پێشەوامانە . بلیمەتی ئیمام دارمی هێندە ئاشكرابووە ، زۆربەی زاناكانی دوای خۆی ، هاوەڵانی سەردەمی خۆی ، مامۆستاكانی ، شایەتی شایستەیان بۆداوە ..

## سونەنی دارمی

ئیمام دارمی یەکێکە لەناودارانی ئەهلی حەدیس ، لە هەر شەش کەسەکەی کەخاوەنی کتێبی فەرمودەن پایەی بڵند ترە ، جگە لەبوخاری ، چونکە هاوزەمان و هاوچەرخی ئیمام بوخاری بووە ..جگە لەکتێبی صەحیحی بوخاری کەس خەبەری دانان و نوسینەوەی کتێبی فەرمودەکانی نەئەزانی .. بە تایبەتی کە دارمی خۆی لە دایك بوی وولاتی سەمەرقەندە و شوێنی بیدعەچێتی و دووری لە سوننەوە بووە .. بۆیە دارمی ویستی زانستی سوننە و گرنگی ئەم زانستە ڕەواج پێ بدات چ بە نوسین ، چ بە زمان .. هەرچەند مێژوو بەسەرهاتی نوسینەوەو یاداشت کردنی ئەم کتێبە نەزانراوە ، بەلاّم ئیمام دارمی کتێبێکی گرنگی نووسی و ناوی نا ﴿ مسند ﴾ ، بەلاّم زانایانی دوای خۆی و لەم سەردەمەدا کە تێبینی ئەوەیان کرد ئەم کتێبەی دارەمی لە کرۆکی سوننەوە نزیکترە ، ناویان نا﴿ سونەن ﴾.

## کۆچی دوایی

ڕۆژێ پێش عەرەفە ، دوای نوێژی عەسری ساڵی (٢٥٥) ی کۆچی لەدونیا دەرچوو .. ڕۆژی هەینی کەڕۆژی عەرەفەبوو ، پاش تەمەنێکی (٧٥) ساڵی بەخاك سپێررا و گەیشتە کاروانی زاناوخواناسان و ئەهلی بەهەشت ..

ئیسحاقی کوڕی خەڵەف ئەڵێ: ﴿ لە خزمەت ئیمام بوخاری دا دانیشتبوین ، کەنامەیەکی بۆهات ، هەواڵیکۆچی دوایی ئیمام دارمی تیابوو .. ئیمام بوخاری سەریداخست ، پاشان سەری بەرزکردەوە و

( استغفر الله) ی کرد .. فرمێسک بەسەر ڕوومەتیا هاتە خوارێ .. ئەم شیعرەی ووت :

**ان تبق تفجع بالاحبة كلهم وفناء نفسك لا ابا لك افجع**

واتە :هەتا بمێنی ، هەوالّی کۆچی ئازیزان گورچکت ئەبڕیٚ .. لەناو چوونی خۆت .. بیٚ باوك بی .. نارەحەت ترە ..

﴿ ئیسحاقی کوڕی خەلەف ﴾ ئەلیٚ: ئیمام بوخاری تەنها جاریٚ بووە کەشیعری وتوە ، ئەویش لە خەفەتی کۆچی دوایی ئیمام دارمی دا وتویەتی .. خوالّی خۆش بیٚ .. ئێمەش دلّشاد کات بە بینینیان لە بەهەشت دا ..



# سەرچاوەکان

## بەشێوەیەکی سەرەکی سوود وەرگیراوە لە

١. موسوعة الحديث الشريف / الكتب التسعة /الاصدار الأول 1.2 شركة صخر لبرامج الحاسب /١٩٩١-١٩٩٦ (CD –R-Disc) .

وەبە پێی پێویست سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە بۆ نوسینی ئەم کتێبە :

٢. فتح الباري /بشرح صحيح البخاري /راجعة قصي محب الدين الخطيب / دار الريان للتراث /المجلد الاول/١٩٨٦/القاهرة.

٣. صحيح مسلم / بشرح النووي / المجلد الأول / دار احياء التراث العربي /بيروت / لبنان .

٤. مختصر سنن أبي داود / للحافظ المنذري / الجزء الأول /دار المعرفة / بيروت لبنان .

٥. الأحاديث القدسية / دار الكتاب العربي / بيروت /لبنان /الجزء الأول/١٩٨٥.



*سوپاس و پێزانین :*

لەڕوی ئەمەکەوە سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی هەموو ئەو مامۆستاو خۆشەویستانە دەکەم کە هاوکارییان کردم بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم کتێبە ، خوای گەورە پاداشتیان بداتەوەو نمونەیان زۆر کات ، بەتایبەتی ئەم بەڕێزانە:

١. مامۆستایان عمر فتاح رێشاوی و نوری فارس حمە خان .

٢. برای نوسەر کاک رزگار کریم کە لە چاپ و پیت چنیندا ئەرکی زۆری کێشا .

٣. هونەرمەندی خامە رەنگین کاک سیروان شریف کە مۆنتێفی بەرگەکەی نەخشاندووە .

# ئەم کتێبە ..

گوزەرکردنێکی خێرایە لەبازاڕی ڕەنگین و گەشتێکی سەرپێییە لەباخی پڕ لە بەرهەمی باخەوانانی گوڵزاری فەرمودەکان و هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی پرشنگدار و تەماشاکردنێکی سەرپێییانەی ئەلبومی وێنە بێ ڕتووشەکانی ئەو بلیمەتانەیە کەعەودالی حەقیقەت بوون .

لەم کتێبەدا ئەم ڕاستیانەمان لاڕۆشنتر دەبێتەوە.

◉ئیسلام پەیامی هەموو گەلانە .. لە نۆ زانای ناوداری فەرمووده ، حەوتیان لەناو نەتەوەکانی تردا سەریان هەڵداوە

◉خوای گەورە بەهەڵخستنی کەسانی وا پەیامی خۆی دەپارێزێ و پایەداری دەکات .

◉وردکاری و پەیڕەوکردنی بنەماکانی لێکۆڵینەوەی زانستی سیمای کاری ئەو زانایانە بووە کەماندوێتی تەی کردنی ڕێگای زانستیان لاحەوانەوەبووە

◉زانایان پێشەوای مەردم بوون .. ژیرانە هەموو چمکەکانیان پێکەوە گرێداوە و بێباکانە باجی پێشەوایەتیان داوە ، بێئاووڕدانەوە هەردەم بەرەوپێش هەنگاوی بوێرانەیان داوە .

◉پێویستە نەوەکانی ئیسلام بزانن کەئەم ئاینە هەروا بەئاسانی نەگەیشتوتە لامان ، دەبا بەوەفابین بۆ هەوڵی ئەو دڵسۆزانە کەژیانی خۆیان بۆ خاتری گەیاندن و پاراستنی پەیامی یەکتاپەرستی لەجیهاندا تەرخان کرد . کەمترین وەفاداری ئێمە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کەهیچ نەبێت لەژیانی ئەوان شارەزابین .